بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: یەئجوج و مەئجوج و سەردەمی نوێ

نووسین: کاوە ئەسعەد حسن

نـەخـشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

نـەخـشەسازیی بەرگ: محمد سیانی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی

ساڵی «٢٠٢٢»ی پێ دراوە.

# پێشەکی نووسەر

## بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خير خلق الله محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، الحمد لله الذي أنزل على عبده الكتاب، أظهر الحق بالحق وأخزى الأحزاب، وأتمَّ نوره، وجعل كيد الكافرين في تباب، نحمَده تبارك وتعالى على المسببات والأسباب، ونسأله السلامة من العذاب وسوء الحساب، وأشهد أن لا إله إلا الله العزيز الوهاب، الملك فوق كل الملوك ورب الأرباب وأشهد أن سيدنا محمدًا عبده ورسوله المستغفِر التواب، أضاء الدنيا بسنته، وأنقذ الأمة بشفاعته، وملأ للمؤمنين براحته من حوضه الأكواب، اللهم صلِّ وسلِّم وبارك عليه وعلى الآل والأصحاب. قال سبحانه وتعالى في كتابه الكريم: (وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ) واتە: ئەی موحەممەد ﷺ ئێمە ئەم کتێبەمان بۆ دابەزاندووی کە قورئانە ڕوونکەرەوە و

ڕێنیشاندەری هەموو شتێکە، وەهەروەها هیدایەت و ڕوێنوینی و موژدەدەرە بۆ موسوڵمانان.

لەم ڕۆژگاری پڕ فیتنەیەدا و لەم سەردەمی جەنجاڵی و غوربەتی ئیسلامەدا کە دونیا پڕبوە لە زوڵم و ستەم و تاوان دژ بە مرۆڤایەتی بەگشتی و ئەهلی ئیسلام و هەڵگرانی تەوحید و کەلیمەی لاالە الاالله بەتایبەتی، ڕۆژانە دەبینین و دەبیستین باس و خواسێکی زۆر دەکرێت سەبارەت بە هاتنی نیشانە گەورەکانی قیامەت بەگشتی و دەرکەوتنی ئیمامی مەهدی و هاتنی دەجال و یەئجوج و مەئجوج بەتایبەتی، یەکێك لەم نیشانانەش دەرکەوتنی (یەئجوج و مەئجوج)ە کە بە بەردەوامی کۆمەڵە پرسیارێکی زۆری لەسەر دەکرێت و جەدەل و نیقاش و مشتومڕێکی زۆری لێ دەبیسترێت، جا هەرکەسەو بەپێی بۆچونی خۆی لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکات، کە هەندێك پێی وایە ئەم دوو گەلە لە ژێر زەوین و لەوێ جیهانێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەندێکی تر دەڵێن: لەپشتی بەستەڵەکەکانی جەمسەری باشورن لە جیهانێك بەدەر لە جیهانی ئێمەی

مرۆڤ وە هەندێکی دیکەش پێی وایە کە لە هەسارەیەکی دیکەوە دێنە سەر زەوی و مەخلوقێکی تەواو جیاوازن لە مرۆڤ، هەروەها بۆچونێکی دیکەش هەیە کە دەڵێن: گەلی چین و مەغۆلیەکان یەئجوج و مەئجوجن، بۆیە لەسەر داوای چەند برایەکی دڵسۆز بۆ ئەم دینە و بەپشتیوانی الله تعالى بەباشمان زانی بەکورتی و بەپوختی باسێکی ئەم بابەتە بکەین، بەو عیلمە کەمەی کە الله تعالى پێی داوین، داواکارم لە الله تعالى تەوفیقمان بداتێ و بتوانین چەند گرێیەك لەسەر ئەم بابەتە بکەینەوە بە جۆرێك کە الله تعالى لە خۆمان ڕازی بکەین، بێگومان ئەگەر پێکامان ئەوە لە الله تعالاوەیە وەئەگەر نەمانپێکا ئەوە لە نەفسی خۆمان و لە شەیتانەوەیە، داواکارم لە الله تعالى ڕێگای حەق و ڕاستیمان لێ وون نەکات و لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان و تابعین ثابت و دامەزراومان بکات، والحمد لله رب العالمين، وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله أجمعين.

براتان: کاوە ئەسعەد حەسەن

٢٨ی ڕەجەب ١٤٤١ی کۆچی

## یەئجوج و مەئجوج لە ڕووی زمانەوانیەوە

یەئجوج وە مەئجوج دوو ووشەیە یان ناوی دوو گەل و هۆزە کە بە زمانی عەرەبی بەم شێوازە دەنوسرێت (يأجوج و مأجوج)، دەوترێت ئەم دوو ووشەیە لە بنچینەدا عەرەبی نین بەڵکوو ئەعجەمین، بە پێی مەعاجیمی زمانی عەرەبی لەوانە (معجم المعاني الجامع) هەروەها (معجم عربي عربي) ئەسڵی ووشەکەش لە ئەجیجەوە هاتوە (الأجيج).

(الأجيج) بە واتای خوڕەی ئاوێکی زۆر بەهێز کە لە تاڤگە بەهێزەکانەوە دێتە خوارەوە ، یان بە واتایەکی دیکە دەنگی ئاگرێکی زۆر گەورە و بڵێسەدار، یان دەنگی دوژمنیکی نادیار، یانیش بە دەنگی کورەی ئاسنگەر دێت کە ئاسنی تیا سوور دەکاتەوە.

لە عەرەبیدا دەوترێت:

أجيج النار: واتا ئاگرەکە خۆشە دەکات، یان دەنگی سووربونەوەی ئاگرەکە.

یان أجیج الماء: واتا دەنگی خوڕەی ئاو کە بە بەهێز و توندی لەسەرەوە بەرەو خواروە دێت.

یان دەوترێت:

یؤجج نار الخصومة، واتا ئاگری شەڕەکە خۆش دەکات .

(أج): فعلەکەیە یان کردارەکەیە

یأجوج: فاعیلەکەیە یان با بڵێین بکەرەکەیە، واتا خۆشکەری ئاگرەکە، یان بکەری ئاگرە بڵێسەدارەکە.

مأجوج: مەفعولەکەیە یان با بڵێین کراوەکە، واتا کراوە بە ئاگرێکی بڵێسەدار، یان کراوە بە ئاوێکی خوڕەدار کە هەموو شتێك لەگەڵ خۆی دەبات. واتە: یەئجوج بکەرە ئەسڵەکەیە و مەئجوج کراوەکەیە یان بڵێین کراوە بە یەئجوجێکی وەکوو ئەسڵەکە.

بەواتایەکی دیکە مەئجوج کۆپی کراوە و وەکوو یەئجوجی لێ هاتوە .

## یەئجوج و مەئجوج لەڕوانگەی قورئانەوە

الله تعالی لە دوو سورەتی جیاوازدا و لە دوو جێگەدا باسی یەئجوج و مەئجوجی بۆ کردوین:

یەکەمیان: کاتێك الله تعالی چیرۆکی ئەو پاشایەمان بۆ باس دەکات کە ناسراوە بە (ذوالقرنين) و گەشت دەکات بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دونیادا، لە یەکێك لە گەشتەکانیدا ئەو بەربەستە دروست دەکات لە نێوانی گەلی یەئجوج و مەئجوج و گەلانی دیکەی دونیادا، کە لە سورەتی الکهف ئایەتەکانی (٩٣بۆ ئایەتی٩٧)ئەم باسە کراوە هەروەکوو دەفەرموێت:

(حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا(٩٣)قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا(٩٤)قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا(٩٥)آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا(٩٦)فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا(٩٧).

دووەمیان: لە سورەتی الأنبیاء ئایەتی(٩٦)باسی ئەم گەلە هاتوە کاتێك کە دەردەکەون و دەکرێنەوە بەڕووی دونیادا و لە هەموو لایەکەوە سەر دەردەکەن، هەروەکوو پێمان دەفەرمووێت:

(حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ).

بەڵام ئێمە پێش ئەوەی بێینە سەر باسی یەئجوج ومەئجوج و ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە باس و زیکری ئەم دوو گەلەی تیاکراوە، کۆمەڵێك پرسیار دروست دەبن لەوانە:

- یەکەم: یەئجوج ومەئجوج کێن ؟؟

- دووەم: ئایا مرۆڤن وەکو خۆمان و لەنەوەی ئادەمن (علیه السلام) یان بونەوەرێکی جیاوازن لە ئێمە؟؟

- سێیەم: ئایا لە ژێر زەوین یان زیندانن یان لەسەر زەوین و وەکوو خۆمان دەژین؟؟

-چوارەم: ئایا ئەو بەربەستەی (سەد)کە ذوالقرنین دروستی کردوە دەکەویٚتە کویٚی سەر زەوی؟! ئایا شکیٚنراوە یان هەر وەکوو خۆی ماوە؟!

ئەمانە وچەندین پرسیاری دیکە کە لیٚرە و لەویٚ دەکریٚن و بوە بە گریٚیەك لای زۆریٚك لە خەڵکی، هە ول دەدەین بە پشتیواني الله بە پیٚی توانا ئەو گریٚیانە بکەینەوە و وەلامي ئەو پرسیارانە بدەینەوە أن شاءالله ..

پیٚشەکی یەئجوج ومەئجوج دوو گەلن یان دووهۆزن کە الله تعالی هەروەکوو پیٚشتریش باسمان کرد لە دوو شویٚنی قورئان باسی کردون یەکەمینیان لە سورەتی الکهف ئایەتی (٩٤) کە ئەفەرموویٚت:

(قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا) واتە: وتیان ئەی ذوالقرنین یەئجوج ومەئجوج فەساد وخراپەکاری بڵاو دەکەنەوە لەسەر زەوی، ئەگەر پارە وپولیٚکت بۆ کۆبکەینەوە ئەتوانی بەربەستیٚك لەبەینی ئیٚمەو ئەواندا دروست بکەیت).

أبن جرير الطبري لە کتێبی تەفسیرەکەیدا (جامع البيان في تفسير آي القرآن) لە تەفسیری سورەتی الکهف ئایەتی٨٣-٩٨چیرۆکی ئەو حاکمە دادپەروەرە موسوڵمانەمان بۆباس دەکات کە حاکمی هەموو سەر زەوی بووە بە ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای دونیادا گەڕاوە، ئەویش کە (ذوالقرنين) بووە.

ئەم پیاوە حاکمێکی دادپەروەر بوو بەبەردەوامی دەگەڕا بەسەر ڕەعیەت و خەڵکەکەیدا، گەشتێك دەکات بەرەو ڕۆژئاوا هەتا دەگاتە شوێنێك دەبینێت خۆر ئاوا دەبێت لەسەر ئاوێکی لێڵ و تاریك، لەوێ گەل و هۆزێك دەبینێت کە کۆمەڵێکیان کافر و زاڵم و ستەم کارن، کۆمەڵەکەی دیکەشیان ئیمانداڕو الله پەرستن، ئەم حاکمەش بەو دەسەڵاتەی کە هەیەتی دادپەروەری الله جێبەجێ دەکات بەسەریاندا، ئەو کۆمەڵەیان کە کافر و ستەمکارن سزا دەدات و کۆمەڵەکەی دیکەش کە الله پەرستن پاداشتیان دەداتەوە و مافی هەموو مافخوراوەکانیش وەردەگرێتەوە بۆیان .

دواتر بەردەوام دەبێت لە گەشتەکەیدا و بەرەو ڕۆژهەڵات دەچێت لەوێش هۆزێکی هەژار و بێ ماڵ وحاڵ دەبینێت کە ژیانێکی سادە و ساکار دەژین، لەوێ هیچی لێ نەکردن تەنها کۆمەڵێك ئامۆژگاری بەسوودی کردن و وازی لێ هێنان، پاشان گەشتەکەی بەردەوام بوو،

هەتا ئەوکاتەی گەیشتە قەومێکی دیکە لە بەینی دوو شاخ دەژیان ، کاتێ ذوالقرنەینیان بینی هاتن بۆ لای وداوایەکیان لێ کرد ،بەڵام ئەم لە زمانی ئەو قەومە تێنەدەگەیشت، هەتا ئەو کاتەی هەرچۆنێك بێت توانرا لە یەك تێ بگەن، داواکەشیان ئەمە بوو.

وتیان ئەی (ذوالقرنین) گەلی یەئجوج و مەئجوج فەساد و خراپەکاری زۆر بڵاو دەکەنەوە لەسەر زەوی، ئەگەر پارە وپولێکت بۆ کۆبکەینەوە دەتوانی بەربەستێك لەبەینی ئێمەو ئەواندا دروست بکەیت؟!

لە وەڵامدا (ذوالقرنین) وتی: ئەو موڵك و هێز وتوانایەی کەالله پێی بەخشیوم زۆر لەوەی ئێوە خێرتر وچاکترە،

وەرن بەهێز وبازوی خۆتان یارمەتیم بدەن بابۆتانی دروست بکەم، بڕۆن ئاسن و(مس)م بۆ کۆبکەنەوەو بۆمی بهێنن، پاشان دەستی کرد بە دروست کردنی بەربەستەکە، ئەوە بوو ئاسنەکەیان کەڵەکە کرد لەسەر یەك و مسەکەیان تواندەوە بەسەریدا بەجۆرێك کەبەشی خوارەوەی بەربەستەکە زۆر ئەستور بوو بۆ ئەوەی ئەو گەلە (یەئجوج و مەئجوج) نەتوانن کونی تێ بکەن وە بەشی سەرەوەی زۆر لوس و خلیسك بوو بۆ ئەوەی نەتوانن بەسەریدا هەڵگەڕێن وسەربکەون.

کاتێك تەواو بوون لە دروست کردنی بەربەستەکە (ذوالقرنین) سەیرێکی کردو وتی: ئەمە ڕەحمەتێك بوو لە الله وە، هەرکات وەعدی اللەش هات ئەیشکێنێت و ورد وخاشی دەکات، ئەوەش باش بزانن کە وەعدی الله حەقە و هەر دێتە جێ.

تێبینی: (ذوالقرنین) یەکێك بوو لە هەرە چاکترین و دادپەروەرترینی ئەو حاکم و دەسەڵاتدارانەی سەرزەوی کە حوکمی هەموو سەرزەوی کردوە لەیەك کاتدا و بەبێ جیاوازی ڕەگەز و زمان و قەومیەت، بە شەریعەت و

دادپەروەری الله کە بەدرێژایی مێژو باسی لێوە کراوە، نەك وەکو حاکم و دەسەڵاتدارانی ئەم سەردەم و زەمانە، کە هیچ دادپەروەریەك نیە لە حوکمڕانیاندا، هۆکارەکەشی هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کارپێنەکردن بە شەریعەت و بەرنامەی الله تعالی و پشتگویٚ خستن و وازهێنان لێی).

ئەمە چیرۆکی ئەو حاکمە دادپەروەرە (ذوالقرنین) بوو بەوجۆرەی کە لە قورئانی پیرۆز لەسورەتی(الکهف) باس و زیکر کراوە و پەیوەندی بە گەلی یەئجوج ومەئجوج .



## ئایا یەئجوج و مەئجوج مرۆڤن وەکو خۆمان ولەنەوەی ئادەمن (علیه السلام) یان بونەوەرێکی جیاوازن لە ئێمە؟؟

لێرەدا بە فەرموودەیەکی صەحیح دەست پێ دەکەین کە ئیمامی بوخاری هێناویەتی لە کتێبەکەیدا کە پشتڕاستی ئەوە دەکاتەوە یەئجوج و مەئجوج مرۆڤن و لەنەوەی ئادەمن (علیه السلام). (عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ يقول الله تعالى يوم القيامة يا آدم، فيقول لبيك وسعديك والخبر في يديك، فيقول الله سبحانه وتعالى، قم فابعث بعث النار من ذريتك. فيقول أدم عليه السلام: يا رب وما بعث النار؟ فيقول الله تعالى: من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعون إلى النار، وواحد إلى الجنة، فحينئذ يشيب الصغير، وتضع كل ذات حمل حملها، وترى الناس سكارى وما هم بسكارى ولكن عذاب الله شديد،قال فاشتد ذلك عليهم قالوا: يا رسول الله ﷺ: أينا ذلك الواحد؟ فقال رسول الله ﷺ: أبشروا فإن منكم واحدا، ومن يأجوج ومأجوج ألفا). رواه البخاري .

واتە: ئەبی سەعیدی خودری الله لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: الله تعالی لە ڕۆژی قیامەت بە ئادەم (علیه السلام) ئەفەرمووێت: ئەی ئادەم ئەهلی دۆزەخم بۆ جیابکەرەوە لە نەوەکانت، ئەویش لەوەڵامدا ئەفەرمووێت: ئەی پەروەردگار جا من چۆن بزانم ئەهلی دۆزەخ کامانەن و ژمارەیان چەندە ؟

الله تعالاش پێی دەفەرموێت لەهەر ١٠٠٠ کەس ٩٩٩ ی بۆ دۆزەخە و یەکێك بۆ بەهەشت، کاتێك هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمەیان بیست ڕەنگیان گۆڕا وتێکچون، وتیان جا ئەو یەك کەسە کێیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مژدەتان لێ بێت یەك کەسەکە لە ئێوەن و ٩٩٩ کەسەکەش لە ئەهلی یەئجوج و مەئجوجن).

لێرەدا لەم فەرموودەیە هەروەکوو زانایان شەرحیان کردوە لەوانە المبارکفوری بەڕەحمەت بێت دەڵێت: الله تعالی بۆچی بە باوکە ئادەم دەڵێت ئەهلی دۆزەخم بۆ جیا بکەرەوە ؟!

لەبەر ئەوەی کە هەرچی مرۆڤە لەو ڕۆژەدا لە مەیدانی مەحشەردا وەستاون هەرهەمووی نەوەی ئادەمن (علیه السلام).

هەروەها الحافظ ابن حجر بەڕەحمەت بێت لە کتێبی فتح الباری لە شەرحی فەرمودەکە دەڵێت: الله تعالی لەناو هەموو پێغەمبەران بە ئادەم علیه السلام دەفەرموێت ئەهلی دۆزەخ دەرکە دەرەوە لەبەر ئەوەی هەموو ئەوانەی کە لە مەیدانی مەحشەردا وەستاون لە ئینسانەکان، نەوەی ئادەمن علیه السلام بە یەئجوج و مەئجوجیشەوە .

کەواتە یەئجوج ومەئجوجیش هەر نەوەی ئادەمن بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو یەك ئیماندارەکە لە ئێوەیە و ٩٩٩ بێ ئیمانەکەش لە یەئجوج و مەئجوجن.

هەروەها ابن کثیر لە (البدایة والنهایة)دا هێناویەتی و بە وردی باسی کردوە کە نوح علیه السلام وهاوەڵە ئیماندارەکانی کاتیك چونە ناو کەشتیەکە و زریانەکە(طوفان) ڕویدا دوعایەکی کرد کە الله تعالی لە

سورەتی نوح بۆمان باس دەکات، دوعاکەش ئەوە بوو: { رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارا}[١]

واتە: ئەی پەروەردگار هیچ کافرێك لەسەر زەوی نەهێڵیت ،(دیارا) واتا هیچ کەسێك .

ئەوە بوو الله تعالی دوعاکەی لێ قبوڵ کرد وە هیچ کافرێك لەسەر زەوی نەما لەدوای نەمانی زریانەکە و لەنگەر گرتنی کەشتیەکە.

بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەوەی کەهیچ کافرێك لەسەر زەوی نەمایەوە لەم ئایەتانەدا بۆمان باس کراوە: {فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ }[٢]

واتە: ئێمە ئەومان ڕزگار کرد(نوح) وەهەروەها ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لەناو کەشتیەکە ڕزگاریان بوو.

تەنها ئەوانەش ڕزگاریان بوو کە لە ناو کەشتیەکەدا بوون لەگەڵ نوح

---

١ - [نوح: ٢٦]

٢ - [العنكبوت: ١٥]

(علیه السلام) ئیتر هەرچی لەسەر زەوی بوون هەمووی تیاچون .

هەروەها الله تعالی دەفەرموزێت: { وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ }[1]

واتە: تەنها نەوە و زوریەتی ئەو، واتا(نوح) مانەوە لەسەر زەوی .

ئەم ئایەتانە هەروەکو ابن کثیر باسی دەکات بەڵگەی تەواوە کە یەئجوج و مەئجوج مرۆڤن وە لەنەوەی نوحن (علیه السلام).

وە هەموو ئەو باس و خواس و پڕوپاگەندانەی کە باس لەوە دەکەن یەئجوج و مەئجوج مرۆڤ نین، یان زۆر بچوکن، یان لە ئەستێرەیەکی دیکەوە دێن هەموی دوورە لە ڕاستیەوە هیچ ئەسڵێکی نیە و هیچ بەڵگەیەکی زانستی ڕاست و دروستی لەسەر نیە .

هەروەها ئیمامی(السفاريني) نەقڵی کردوە لە (ابن کثیر) کە یەئجوج و مەئجوج دوو هۆزی تورکن لە نەوەی ئادەمن علیه السلام، پاشان

[1] - [الصافات: ٧٧]

دەفەرموویٚت: لەنەوەی نوح (علیه السلام) و سولالەی یافثی کوڕی نوحن.

لیٚرەدا قەولیٚکی لاواز و مونکەر هەیە کە دەڵیٚت ئادەم (علیه السلام) خەوتوە وتوشی (ئیحتلام) لەشگرانی بوە و تۆوەکەی لەگەڵ خۆڵ تیٚکەڵ بوە و ئەم دوو گەلەی لیٚ پەیدا بووە، واتا لە دایکە حواء نین، ئەویش قەولیٚکی زۆر لاوازە و زانایان بە لاواز ومونکەریان داناوە لەبەر ئەوەی خیلاف و پیٚچەوانەی ئایەتی قورئانە، هەروەکو ابن کثیر شەرحی کردوە و ئایەتەکانمان لەسەرەوە باس کرد .



## ذوالقرنین ئەو بەربەستەی لە کوێ دروست کرد و ئەو گەلە موفسیدە لە کوێ دەژیان؟؟

لە سورەتی الکهف لە ئایەتی ٩٣دا الله تعالی دەفەرمووێت:

(حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا)

واتە: کاتێك ذوالقرنین گەیشتە بەینی (السدین) لەوێ لەو بەینە هۆزێکی بینی زمانیان جیاواز بوو لێیان تێنەدەگەیشتین.

ابن جریر الطبری لە کتێبەکەیدا (جامع البيان في تفسير آي القران) قەولی ابن عباس (الله لەخۆی و باوکی ڕازی بێت) دەهێنێتەوە کە دەفەرمووێت: (السدین) مەبەست لێی دوو شاخە.

واتا ذوالقرنین گەیشتە نێوانی دوو شاخ لەوێدا ئەو هۆزە ستەم لێکراوەی بینی، وەهەروەها ابن عباس دەفەرمووێت: ئەو دوو شاخە **(ئەرمینیا و ئەزربایجانە)** .

عن ابن عباس (حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ) قال: الجبلين الردم الذي بين يأجوج ومأجوج، أمتين من وراء ردم ذي القرنين، قال : الجبلان هما أرمينية وأذربيجان.

واتە: (حتى اذا بلغ بين السدين) ابن عباس دەڵێت : ئەو دوو شاخە ئەو شوێنەیە كە (ذوالقرنين) بەربەستەكەی لەنێوانیاندا دروست كرد یەئجوج و مەئجوجی جیاكردەوە لەگەڵ هۆز و گەلەكانی ئەمدیوی شاخەكان، ئەو دوو شاخەش ئەرمینیا و ئەزربایجانە.

ئەرمینیا و ئەزربایجانیش لە نەخشەی ئەمڕۆدا دوو وڵاتن كە دەكەونە نێوانی (زنجیرە چیاكانی قەوقازەوە)، ئەم دوو وڵاتەش پێكهاتەی جوگرافیان دەكەوێتە باكوری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ، سنوریشیان لەگەڵ توركیا وجۆرجیادا هەیە، ئەم زنجیرە چیایە دەریای قەزوین (خەزەر) دەبەستێتەوە بە دەریای ڕەش (البحر الأسود)، زنجیرە چیایەكی زۆر چڕو درێژە، هەروەها چیاكانی زۆر بەرزن كە لەهەندێك شوێندا بەرزی چیاكانی زیاتر لە شەش هەزار مەترە.

بەكورتی لەسەر قەولی ابن عباس (الله لێی ڕازی بێت) ئەو بەربەستەی كە (ذوالقرنین) دروستی كرد دەكەوێتە نێوان زنجیرە چیاكانی قەوقازەوە لە نێوان ئەرمینیا و ئەزربایجان .

هەروەها بەڵگەیەكی دیكە كە پشت ڕاستی ئەو قەولەی ابن عباس دەكاتەوە ئەوەیە، كاتێك (ذوالقرنین) گەشتەكەی دەست پێكرد بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشت هەتا گەیشت بە دەریایەك كە ڕەنگی ئاوەكەی لێڵ وڕەش و تاریك بوو هەروەكو لە ئایەتەكەدا دەفەرمووێت:

(حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ)

(عين حمئة) واتا: ئاوێكی ڕەش و لێڵ، دەریای ڕەشیش لە نەخشەدا دەكەوێتە ڕۆژئاوای زنجیرە چیاكانی قەوقازەوە، كەبەوەش ناسراوە ئاوەكەی ڕەش ولێڵ و تاریكە هەربۆیە ناویشی دەریای ڕەشە (البحر الأسود)!!

ئەو زنجیرە چیایە هەروەکو وتمان دەریای قەزوین(خەزەر) دەبەستێتەوە بە دەریای ڕەش ئەمدیوی چیاکان وڵاتەکانی ئەرمینیا وجۆرجیا و ئەزربایجانە، وە ئەودیوی چیاکان وڵاتەکانی ڕوسیا و ئۆکرانیایە، ئەگەر لەو وڵاتانەی ڕوسیا و ئۆکرانیاوە بتەوێت بێیت بۆ ئەم وڵاتانەی ئەرمینیا و ئەزربایجان و جۆرجیا بەڕێگای ووشکانی، دەبێت بەنێوانی ئەو زنجیرە چیایەدا تێپەڕیت لەبەرئەوەی هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە پێیدا تێپەڕیت، لە شوێنێکیشدا ڕێگاکە زۆر تەسك دەبێتەوە کە ڕێك دەکەوێتە بەینی دوو شاخەوە، ئەو شوێنەش پێی دەوترێت نۆکەندی داریال (مضيق داريال) کە ئەم ڕێگایە پێدەچێت شوێنی بەربەستەکەی (ذوالقرنین) بووبێت والله أعلم لەبەر ئەوەی هیچ شوێنێکی دیکە نیە لەنێوان ئەو زنجیرە چیایە بەڕادەی ئەو شوێنە ڕێگاکە تەسك بوبێتەوە .

پاش ئەوەی بۆمان ڕوون بووە کە ذوالقرنین بەربەستەکەی لە نێوان زنجیرە چیاکانی قەوقاز دروست کردوە بەپێی ئەو تەفسیرەی ابن عباس الله لێی ڕازی بێت، ئەوەشمان زانی کە ئەم زنجیرە چیایە زۆر چڕو درێژە

هەردوو دەریای قەزوین (الخزر) و دەریای ڕەش (البحر الأسود) دەبەستێتەوە بە یەکتری، ماوەتەوە بڵێین ئایا ئەو بەربەستە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هەر وەکوو خۆی ماوەتەوە؟

ئەی ئەگەر هەر لە شوێنی خۆی ماوتەوە بۆ هەتا ئێستا کەسێك نەیبینیوە؟



## ئایا ئەو بەربەستەی ذوالقرنین دروستی کرد شکێنرا ؟ یان هەر وەکو خۆی ماوەتەوە و لە ئاخری زەماندا دەشکێنرێت؟

بە فەرموودەیەکی دایکی ئیماندار دایکە زەینەب الله لێی ڕازی بێت دەست پێدەکەین کە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموویت:

(عن أمّ المؤمنين زينب -رضي الله عنها- أنها قالت: "أنَّ النبيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا فَزِعًا يقولُ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، ويْلٌ لِلْعَرَبِ من شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ اليومَ مِن رَدْمِ يَأْجُوجَ، ومأْجُوجَ مِثْلُ هذا، وحَلَّقَ بإصْبَعِهِ، وبالَّتي تَلِيهَا فَقَالَتْ زَيْنَبُ فَقُلْتُ يا رَسولَ اللَّهِ ﷺ أنَهْلِكُ وفينَا الصَّالِحُونَ؟ قالَ: نَعَمْ إذَا كَثُرَ الخَبَثُ)) . رواه البخاري

واتە: دایکی ئیمانداران زەینەب (الله لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لای ئەو بوو لە کاتێکدا خەوتبوو لە ناکاودا لەخەو ڕاپەڕی و خەبەری بووەوە و سورهەڵگەڕابوو عارەقێکی زۆری کردبووەوە، فەرمووی (لاألە الاالله) هاوار و واوەیلا بۆ عەرەب بۆ شەڕ وئاژاوەیەك

كه لێیان نزيك بووه‌وه، ئه‌مڕۆ له به‌ربه‌سته‌كه‌ی يأجوج ومأجوج به‌قه‌ده‌ر ئه‌مه كرايه‌وه، (به‌په‌نجه‌ی شايه‌تمان وپه‌نجه گه‌وره‌ی بازنه‌يه‌كی دروست كرد) دايكه زه‌ينه‌ب ئه‌فه‌رموێت منيش پرسيم ياره‌سول الله ﷺ توشی نارِه‌حه‌تی وهيلاكی ده‌بين له‌كاتێكدا كه‌سانی چاكمان تێدايه؟ فه‌رمووی: به‌ڵێ، ئه‌گه‌ر تاوان و خراپه‌كاری زۆر بوو له‌ناوتان)) .

فه‌رموده‌كه سه‌حيحه وئيمامی بوخاری ده‌يگێڕێته‌وه .

له‌م فه‌رموده‌يه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ زۆر به ڕوون و ئاشكرا پێمان ده‌ڵێ كه به‌ربه‌سته‌كه له‌و سه‌رده‌م وزه‌مانه‌دا شكێنرا.

پێشتريش له به‌شه‌كانی پێشوو باسمان له‌وه‌كرد كه له ته‌فسيری الطبری دا هاتوه كاتێك ذوالقرنين ئه‌و به‌ربه‌سته‌ی دروست كرد به شێوازێك دروستی كرد كه هيچ كه‌سێك نه‌توانێت بيشكێنێت ، ته‌نها الله نه‌بێت له كاتی خۆی وورد وخاشی ده‌كات كه وه‌عد و كاتی خۆی هات،

هەروەکوو لە ئایەتەکەدا هاتوە: (قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا).

واتە: ئەمە ڕەحمەتێك بوو لە پەروەدگارمەوە(دروست کردنی بەربەستەکە) وە هەرکاتێك وەعد وبەڵێنی پەروەردگارم هات وورد وخاشی دەکات ولەگەڵ زەویدا سافی دەکات) . ئەمە دەقی تەفسیرەکەیە

واتە: ئەم بەربەستە تەنها الله تعالى خۆی دەیشکێنێت ولەناوی دەبات بەڵام بۆ ئەو کاتەی کە الله تعالى خۆی دەیەوێت و بەڵێنی دەهێنێتە جێ، هیچ کەسێکیش ناتوانێت بیشکێنێت لە غەیری الله تعالى ئایەتەکەی الله تعالاش زۆر ڕوونە کە دەفەرمووێت: (فأذا جاء وعد ربي جعله دكاء) واتە: کاتێك بەڵێنی الله تعالى هات وورد و خاشی دەکات و لەگەڵ زەوی تەختی دەکات واتا الله تعالى خۆی وورد و خاشی دەکات، هەروەها کاتێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ خەونەکەی بینی بەربەستەکە لێی شکا واتا لەو کات و زەمانەدا بەڵێنی الله تعالى بەدیهات و بەربەستەکە کرایەوە، هەمووشمان دەزانین کە خەونی پێغەمبەران حەقە وەحی الله تعالى یە .

بەڵام لێرەدا فەرمودەیەکی دیکەمان هەیە کە أبو هورەیرە الله لێی ڕازی بێت بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەفەرموویێت:

(إنَّ يأجوجَ ومأجوجَ يحفُرونَ كلَّ يومٍ حتَّى إذا كادوا يَرونَ شُعاعَ الشَّمسِ قالَ الَّذي عليهم ارجِعوا فسنَحفرُهُ غدًا فيعيدُهُ اللَّهُ أشدَّ ما كانَ حتَّى إذا بلَغت مُدَّتُهم وأرادَ اللَّهُ أن يبعثَهُم علَى النَّاسِ حفروا حتَّى إذا كادوا يَرونَ شعاعَ الشَّمسِ قالَ الَّذي عليهِم ارجِعوا فستحفُرونَهُ غدًا إن شاءَ اللَّهُ تعالى واستَثنَوا فيعودونَ إليهِ وَهوَ كَهَيئتِهِ حينَ ترَكوهُ فيحفُرونَهُ ويخرجونَ علَى النَّاسِ)) . صحيح ابن ماجة

واتە: گەلی یەئجوج ومەئجوج هەموو ڕۆژێك لەو بەربەستە هەڵدەکەنن هەتا دەگاتە ئەوەی کونی تێ دەکەن و تیشکی خۆر لەودیوی بەر بەستەکەوە دەبینن،پاشان ئەو کەسەی کە سەرپەرشتیان دەکات پێیان دەڵێت ئەمڕۆ بەسە بگەڕێنەوە سبەینێ دێینەوە تەواوی دەکەین، پاشان الله تعالی بەربەستەکە دەگەڕێنێتەوە وەکوو خۆی و بەهێزتر لە جاران، هەتا ئەو کاتەی کە کاتی دەرچونیان دێت و ویستی الله تعالی لەسەر ئەوە

دەبێت کە دەرچن و بکرێنەوە بەسەر جیهاندا، دەست دەکەن بە هەڵکەندنی بەربەستەکە هەتا ئەوەی کونی تێ دەکەن و تیشکی خۆر لەودیوی بەربەستەکەوە دەبینن،سەرپەرشتکارەکەیان جارێکی دیکە دەڵێت ئەمڕۆ بەسە بگەڕێنەوە سبەی ان شاء الله تعالی تەواوی دەکەین، ئەمجارەیان بۆ ڕۆژی دواتر کە دەگەڕێنەوە بۆ هەڵکەندنی بەربەستەکە دەبینن وەکوو خۆی ماوەتەوە کە چۆن دوێنێ بەجێیانهێشت، ئەوکات هەڵیدەکەنن و دەردەچن بەسەر خەڵکیدا) .

ئەم فەرموودەیە هەندێك لە ئەهلی عیلم و ئەوکەسانەی بەناوی دینەوە قسە دەکەن، دەیکەن بە بەڵگەی ئەوەی کە هەتاوەکوو ئێستا یەئجوج و مەئجوج دەرنەچونەتە دەرەوە و هەر لە پشتی بەربەستەکەی ذوالقەرنەینەوە ماونەتەوە !!

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم فەرموودەیە ناکرێت بە بەڵگە، لەبەر چەند هۆکارێك کە دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

- یەکەم: فەرموودەکە لەگەڵ ئایەتەکەی سورەتی الكهف یەك ناگرنەوە چونکە لە ئایەتەکەدا الله تعالى بە ڕوونی پێمان دەڵێت کە الله تعالى خودی خۆی ئەو بەربەستە دەشکێنێت و لەگەڵ زەوی تەختی دەکات هەروەکوو دەفەرموویت: (فأذا جاء وعد ربي جعله دكاء)، بەڵام لە فەرموودەکە دەڵێت کە یەئجوج و مەئجوج خۆیان ئەو بەربەستە دەشکێنن!!

- دووەم: هەروەها ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەکەی دایکە زەینەبیش الله لێی ڕازی بێت یەك ناگرنەوە چونکە لە فەرمودەکەی دایکە زەینەب پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: (فتح اليوم من ردم يأجوج ومأجوج مثل هذه))

واتا: ئەمڕۆ لە بەربەستەکەی یەئجوج ومەئجوج ئەوەندە کرایەوە بە پێچەوانەی ئەم فەرمودەیە کە دەڵێت یەئجوج و مەئجوج خۆیان ئەو بەربەستە دەشکێنن!!

- سێیەم: فەرموودەکەی دایکە زەینەب لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە کە سەنەدەکەی (صحیح)ە بە کۆدەنگی زانایان، بەڵام ئەم فەرموودەیە ابن ماجە و ترمذی هێناویانە سەنەدەکەشی (حسن، غریب)ە هەروەها فەرمودەکە عللەتی تێدایە، عیللەتەکەش ئەوەیە کە پچڕانی تێدایە لە ڕاویەکان بۆیە ناکرێت بە بەڵگە.

بۆیە بە بەڵگەی ئایەتەکەی سورەتی الكهف کە الله تعالی بەڵێنی داوە خۆی ئەو بەربەستە بشکێنێت، هەروەها بە بەڵگەی فەرمودەکەی دایکە زەینەب کە پێغەمبەر ﷺ لە خەونیدا بینی کە بەربەستەکە کرایەوە، دەتوانین بڵێین ئەو بەربەستە هەر لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ شکێنرا و کرایەوە والله أعلم.



# گەلانی پشتی چیاکانی قەوقاز(پشتی بەربەستەکە)و دروستکردنی دەوڵەتی خەزەر

دوای ئەوەی زانیمان کە بەربەستەکە دەکەوێتە کوێی سەر زەوی، ئێستا بابزانین ئەو گەل و هۆزانەی ئەو ناوچانە کێ بوون و چی پەیوەندیەکیان هەیە بە باسەکەمانەوە.

ئایا ئەوکاتەی کە ذوالقرنین ئەو بەربەستەی دروست کرد لەو ناوچەیەدا ئەو گەلانەکێ بوون کە لە پشتی چیاکانی قەوقازەوە دەژیان کە قورئانی پیرۆز بە یەئجوج و مەئجوج ناوی بردون وە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا وولاتەکانی ڕوسیا وئۆکرانیا دەگرێتەوە؟؟

سەرەتا بە بەڵگەیەك لەسەر زاری خۆیانەوە دەست پێدەکەین، ئەویش نوسەرێکی یەهودیە بەناوی آرثر کیستلەر (١٩٠٥ - ١٩٨٣) خەڵکی وولاتی هەنگاریایە ، بەڵام هەر لەتەمەنی منداڵیدا لەگەڵ خێزانەکەیدا هەنگاریایان جێهێشتوە و لە بەریتانیا نیشتەجێ دەبن،

ئەم کەسە کتێبێکی پڕ زانیاری و گرنگی نووسیوە کە پەیوەندیەکی زۆری بەم بابەتەوە هەیە و چەندین گرێمان بۆ دەکاتەوە ودەتوانین سودی لێ وەربگرین.

بۆیە ئەم نووسەرەشمان هەڵبژاردوە لەبەر ئەوەی خۆی یەهودیە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نیە تاکوو هیچ بیانویەك نەمێنێت بۆ هیچ کەسێك، کتێبەکەشی بەناوی (هۆزی سیانزەیەمین)کە بە عەرەبی ناوی (القبیلة الثالثة عشرة) وە لە ڕاستیدا زۆربەی زانیاریەکانی ناوی کتێبەکەی تاڕادەیەکی باش پشتی بەستوە بە مێژونوسە عەرەبەکان وەکو: (المسعودی، ابن فضلان ،الأصطخری ،البکری ،ابن رستە ،الیعقوبی ،أبن ندیم وە الدمشقی)

نووسەر لە کتێبەکەیدا باسی ئەو گەل وهۆزانە دەکات کە لە پشتی چیاکانی قەوقازەوە ژیاون، واتە: هەمان شوێنی نیشتەجێبوونی یەئجوج ومەئجوج کە لەم سەردەمەدا بەشێك لە وڵاتەکانی ڕوسیا و ئۆکرانیا دەگرێتەوە، دەڵێت لەو شوێنە کۆمەڵە هۆزێك ژیاون زۆر شەڕانگێز

وخراپەکار بوون کە هەموو بژێوی ژیانیان لەسەر تاڵانی وڕاوو ڕوت وکوشتن بووە، (ڕێك لەگەڵ ئەو وەسفەی کە الله تعالی باسی یەئجوج ومەئجوجی کردوە لە قورئاندا یەك دەگرنەوە)، هەروەکوو الله تعالی دەفەرموویت:

(قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ).

واتە: (وتیان ئەی ذوالقرنین یەئجوج ومەئجوج فەساد و خراپەکاری بڵاو دەکەنەوە لەسەر زەوی) .

پاشان نووسەر دەڵێت: ئەم هۆزە شەڕانگێزانە بە شێوەی گەلەکۆمەك هەڵیاندەکوتایە سەر ئەو هۆزانەی کە بێ توانا و بێ هێز وبێ دەسەڵات بوون، کوشتارێکی زۆریان لێ دەکردن ودەستیان دەکرد بە ڕاوو ڕوت و تاڵانی، پاشان هەرچی ماڵ و موڵك وسەروەت وسامانی ئەو هۆزە بێ دەسەڵاتانە هەبو بۆ خۆیانیان دەبرد.

بەو جۆرە شەڕانگێزی و خراپەکاری و زوڵم و ستەمەی کە دەیانکرد بەردەوام بوون هەتا ئەوکاتەی دەوڵەتێکیان بۆخۆیان دروست کرد لەسەدەی ٢بۆ٣ی زاینی ، سنوری ئەم دەوڵەتە لە باشورەوە بەدرێژایی چیاکانی قەوقاز بوو وەلە ڕۆژهەڵاتەوە دەریای قەزوین و لەڕۆژئاواوە دەریای ڕەش (بحر الأسود) ولە باکوریشەوە هەتا دەگاتە ڕوباری ڤۆڵگای ڕوسیا سنوریان بوو، وە دوەڵەتەکەیان ناونا (خەزەر) .

ئەم دەوڵەتە هیچ ئاینێکیان نەبوو حوکومڕانیشیان لەسەر هیچ بنەمایەکی ئاینی ئاسمانی بەڕێوە نەدەبرا وبنیات نەنرابوو بەڵکو بییرو باوەڕێکی (وەثەنیان) هەبو، واتا بڕوایان بە کۆمەڵێک خوڕافات هەبوو وەکوو پرۆزی ئاگر و پیرۆزی ڕوبار و دەریا و لەگەڵیشیدا پەیکەر پەرستن، بەم شێوەیە بەردەوام بوون چەند سەدەیەك، هەتا ئەو کاتەی کە وەفدێکی یەهودی لە یەهودەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسی ئەو کاتە، لە سەدەی٧ و بەوردی لەساڵی٧٤٠ی زاینی سەردانیان دەکەن و سەرۆکەکەیان دەبینن کە پێیان دەگوت (الخاقان نوران)، ئەم وەفدە جولەکەیە بۆ چەند ڕۆژێك دەمێننەوە

و گفوگۆیەکی چڕ دەکەن لەگەڵ ئەو سەرۆکە و پاشان دەگەڕێنەوە .

ئەم سەرۆکەش لەدوای گەڕانەوەی وەفدی جولەکەکانی دەوڵەتی فارسی دەسبەجێ ئاینی خۆی گۆڕی و بوو بە یەهودی!!!

هەروەها زۆربەی دارودەستەکەی وخەڵکی دەوڵەتەکەشی ئاینیان گۆڕی و بوون بە یەهودی ، هەتا ئەو کاتەی ئیتر ئاینی ڕەسمی وڵات بوو بە ئاینی یەهودی .

ئەوەشمان بیبیر نەچێت کە بژێوی و داهاتی ئەم دەوڵەتەش لەسەر باج و خەراجی هاوڵاتیانی خۆیان و وڵاتانی دراوسێ ونزیکی خۆیان بوو وەکو دەوڵەتی بیزەنتی وفارسی، لێیان دەسەندن بەحوکمی هەڵکەوتەی شوێنەکەیان .

پاشان ئەم دەوڵەتە هەر لەگەشەسەندندا بوو (ئەمەویێت ئاماژە بەوە بکەم کە لەهەمان کاتدا ئیسلام هاتبوو وە دەوڵەتی ئیسلامیش دامەزرابوو) دەوڵەتی خەزەر بەردەوام بوو تاکو بوو بەیەکێك لەئیمپراتۆرە بەهێزەکانی

ئەو سەردەمە لەدوای ئیمپراتۆریەتی رۆم ودەوڵەتی ئیسلام بەتایبەتی لە ڕووی ئابوریەوە زۆر بەهێز وبتەو بوو، لەبەرئەوەی کاری سەرەکیان کۆکردنەوە و پاشەکەوتکردنی ئاڵتون بوو کە ئەمە پیشەی سەرەکی یەهودیەکانە لەهەموو سەردەم وزەمانێکدا، دەبێت ئەوەشمان لەیاد نەچێت لە هەموو کاتێکدا ئەم دەوڵەتە هەرخەریکی فیتنە و ئاژاوە نانەوە بوون لە بەینی حکومەت وئیمپراتۆریەتەکانی ئەو سەردەم وزەمانەدا ، چەندین جەنگ و شەڕیان هەڵگیرساند لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی دراوسێی خۆیان، لەوانە جەنگی نێوان دەوڵەتی فارسی و دەوڵەتی بیزەنتی کە چەندین سەدەی خایاند، هەروەها خۆشیان بەشداری چەندین جەنگیان کرد دژی دەوڵەتانی دیکە، بەڵام بۆ دواجار لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کۆتایی بەو دەوڵەتە شەڕانگێز وئاژاوەگێڕە هێنرا و ئەو ناوچانەیان لێ فەتح کردن و کەوتنە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامەوە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنج وتێبینیە لەدوای کۆتایی هاتنی ئەو دەوڵەتە هەرچی یەهودیەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە بوو (خەڵکە

ڕەسەنەکەی) هەموویان کۆچیان کرد بۆ وڵاتەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی ئێستا کە وڵاتەکانی وەکو(ڕوسیا، ڕوسیای سپی، ئۆکرانیا، پۆڵۆنیا، هەنگاریا.........هتد)دەگرێتەوە وەچەند وڵاتێکی ئەورووپای ڕۆژئاواش لەوانە (ئەڵمانیا ،نەمسا) واتا هیچکام لەو یەهودیانەی دەوڵەتی خەزەر نەبوون بە ئیسلام و ئیسلامیان قبوڵ نەکرد کاتێك ئیسلامیان پێ گەیشت کە لە بنچینەدا خەڵکە ڕەسەنەکەی پشتی چیاکانی قەوقاز بوون کە ذوالقرنین بەربەستەکەی دروست کرد لەو شوێنە تاکوو جیایان بکاتەوە لە خەڵکانی ئەمدیوی چیاکان .

هەر بۆ زانیاریش ئەو یەهودیانەی کە باسمان کردن پێیان دەوترا یەهودی (ئەشکەناز) یان یەهودی (خەزەر)کەلەسەدا ٩٥ی هەموو یەهودیەکانی دونیا پێك دەهێنن ، واتا تەنها لەسەدا ٥ی یەهودیەکانی دونیا سەر بە یەهودی بەنی ئیسرائیلن.

## بڵاوبونەوەی یەهودیە خەزەریەکان بە جیهاندا و گۆڕانکاری ڕیشەیی لە جیهان

لێرەدا سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ ووردەکاری کۆچکردنی ئەم یەهودیانەی خەزەر یان (ئەشکەناز)بۆ ئەو وڵاتە ئەوروپیانەی باسمان کرد،

بزانین لەو ووڵاتانە چیان کرد وخەریکی چی بوون ؟؟

ئامانجی سەرەکیشیان چی بوو؟؟

هەروەکو پێشتر باسمان کرد کە ئەو گەلانەی پشتی چیاکانی قەوقاز خەڵکانێکی شەڕانگێز وخراپەکار و موفسید بوون هیچ درێغیەکیان نەدەکرد لە کوشتن وتاڵانی وفەساد بڵاوکردنەوە ، بەهەمان شێوەی گەلی یەئجوج ومەئجوج وەکو چۆن الله تعالى لە قورئان وەسفی کردون ، هەر لەبەر ئەو شەڕانگێزی و زوڵم وستەمەیان بوو ئەو گەلە ستەم لێکراوەی ئەمدیوی چیاکان بە ذوالقرنەینیان وت بەربەستێکمان بۆ دروست بکە و ئەوان لە ئێمە جیابکەرەوە هەروەکوو الله تعالى دەفەرموویێت:

(قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا).

هەروەها گۆڕینی ئاینیان لە وەثەنیەت وبت پەرستیەوە بۆ یەهودیەت کە بوو بە ئاینی ڕەسمی دەوڵەتەکەیان(بەڵام لە ڕاستیدا یەهودی بوونیان تەنها بۆ مەبەستی گڵاوی خۆیان بوو ئەگینا هیچ پەیوەندیەکیان بە بییر وباوەڕی یەهودیەتەوە نەبوە وە پەیڕەوی بییروباوەڕی یەهودیەتیشیان نەدەکرد بەتایبەتی سەرکردە و گەورەکانیان)

کاتێك کۆچیشیان کرد بۆ وولاتانی ئەوروپا سەرەتا ڕویان کردە بازرگانی کردن وپارە و ئاڵتون پەیدا کردن وماڵ وموڵك کڕین وسەرووەت کۆکردنەوە، بێگوێدانە یاسا وڕێساکانی بازرگانی و ڕێنماییە بازرگانیەکانی ئەو ولاتانەی کە نیشتەجێ بوون تێیدا، هەروەها بێ گوێدانە یاسا و ڕێسا ئاینی و ئاسمانیەکان، چونکە دەیانزانی کە بە بەهێزبوونی ئابوریان دەتوانن دەست بگرن بەسەر دامودەزگا هەستیارەکانی ئەو حکومەت و وولاتانە و هەرچۆنێکیان بوێ بەکاریان بهێنن،

لە هەمان کاتیشدا هەر خەریکی پشێوی وئاژاوەنانەوە وفەساد بڵاوکردنەوە بوون وەکوو پیشەی هەمیشەییان لەو وڵاتانەدا، هەتا وایلێهات بە تێپەڕبوونی کات بوون بە هاوڵاتی پلە یەکی ئەو ووڵاتانە و کۆمەڵێکی زۆریان لیٚ هەڵکەوت ودەوڵەمەند بوون وسەروەت وسامانێکی زۆریان بۆ خۆیان کۆکردەوە ،بەجۆرێك بنەماڵەی وایان تیاهەڵکەوت کەزۆربەی حکومەتی ئەو ووڵاتانەی کە تیا نیشتەجیٚ بوون دەخستە ژێر باری قەرزی خۆیانەوە، لەو بنەماڵانەش کە زۆر بەناوبانگ بوون (بنەماڵەی رۆچێلد ، رۆکفیلەر ،مۆرگان) .کەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەم بنەماڵانە نەوە و وەچەکانیان هەر بەو جۆرە ماونەتەوە ، بۆزانیاریشتان کەسانی زۆر بەناوبانگ ودیاریان تێدایە ،

بەوجۆرە ڕۆیشتن هەتا کار گەیشت بەوەی هەموو ئەو حکومەتانەیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە وهەرچی داخوازی وداواکاریەکیان هەبوایە لەلایەن ئەو حکومەتانەوە بۆیان جیٚ بە جی دەکرا، بەحوکمی ئەو سەروەت و سامانە زەبەلاحەی کە هەیانبوو ، ئەوەشمان بییر نەچێت ئەمانە

بەهەموو کونج وجێگەیەکی ئەوروپادا بڵاو بوبونەوە ودەستیان گرتبوو بەسەر زۆرترین دامودەزگا هەستیارەکانی ئەو وولآتانەدا .

لەم هەلومەرجانەدا هەستان بەدامەزراندنی چەند رێکخراوێکی نهێنی کەئامانجیان لێی دەستگرتن بوو بەسەرهەموو جیهاندا وبەکۆیلە کردنی خەڵکی، کە ئەمەش پلانێکی تەواو شەیتانی بوو (مەبەستی سەرەکیشیان ئەوە بوو جیهان لەلایەن ئەوانەوە بەڕێوە ببرێت بەو شێوەیەی کە خۆیان مەبەستیانە ودەیانەوێت خەڵکیش وەکو خۆیان لیٚ بکەن) بە بیٚ ئەوەی خۆیان ئاشکرا بکەن وکەس بە پلانەکانیان بزانێت جگە لە خۆیان ،

لەو ڕێکخراوە دیارانەش ڕێکخراوی (ماسۆنی ، ئێلۆميناتی وە ڕێکخراوی زایۆنی) هەروەها کۆمەڵێك ڕێکخراوی دیکەش.

ئامانجی ئەم ڕێکخراوانەش بڵاوکردنەوەی فەساد و بەدڕەوشتی و نەهێشتنی دین و ئیمان بوو لەناو خەڵکیدا بە گشتی و لەناو موسوڵمانانـدا بە تایبەتی، گەورەترین چەکیش بەدەستیانەوە لە دوای پارە و سەروەت و

سامان، ئافرەت بوو کە بەداخەوە کاریگەریەکی تەواویان کردە سەر ئافرەتان بەناوی کرانەوە و ئازادی ومافی مرۆڤ و جۆرەها قسەی بریقەدار ،کەبەهۆیەوە توانیان ئافرەتان لە ماڵ دەرکەن و ڕوتیان بکەنەوە و شەرم وحەیایان لەسەر هەڵگرن و کۆمەڵگا تێکبچێت و بەرەو ئاقارێکی خراپی بەرن بەمەش گەورەترین ئامانجیان پێکا .

جا بابێینە سەر باسی یەکێك لەو ڕێکخراوانەی کە لای زۆربەی خەڵکی ناسراوە و ئاشکرایە ئەویش ڕێکخراوی زایۆنیە(الصهیونیة) ، ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٨٩٧ لە وڵاتی سویسرا دامەزرا ودروست بوو لەلایەن کۆمەڵێك یەهودی بەسەرکردایەتی (ثیۆدۆر هێرتزل) کە یەهودیەکی خەزەری بوو لەوڵاتی نەمسا نیشتەجێبوو ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەی هەبوو،

ئامانجی سەرەکی لەدروست کردنی ئەم ڕێکخراوە کۆکردنەوەی هەموو ئەو یەهودیە خەزەرانەی کە لە قەوقازەوە کۆچیان کردبوو بۆ ئەو وڵاتانەی ئەوروپا کە پێشترئاماژەمان پێی دابوو، پاشان دامەزراندنی دەوڵەتێکی

سەربەخۆ بۆیان لەسەر زەوی قودس وخاکی فەلەستین وە نیشتەجێ کردنیان لەوێ، هەروەها بە نهێنیش بەردەوام بوون لە داڕشتنی چەند پلانێکی گڵاو ونەگریس لەوانە پلانگێڕان بۆ هەڵگیرساندنی چەند جەنگێکی یەك لەدوای یەك ، کە هەرجەنگێك لەم جەنگانە کۆمەڵێك پلان وبەرژەوەندی تایبەتی لە پشتەوە بوو دیارترینیان داماڵینی دین وئاین بوو لە خەڵکی وکۆمەڵگا وبەئیلحاد کردنی خەڵکی.

هەروەك دەزانین لە هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی یەکەم دەوڵەتی خەلافەتی عوسمانی ئیسلامیان تواندەوە ، کە بە پلانی ئەوان دەوڵەتی عوسمانی خزایە ناو ئەو جەنگە خوێناویە لەلایەك ، لەهەمان کاتدا دروست کردنی حیزبێکی فاشیستی عەلمانی بێدینی ڕەگەز پەرستی لەناو خاکی تورکیادا بەناوی (حركة الأتحاد والترقي)،کە بزوتنەوەیەکی ئیلحادی ودژە ئیسلام بوو بە سەرۆکایەتی (کمال ئەتاتۆرك) کە یەهودیەکی خەزەری بوو بەڕەچەڵەك !! لە وولاتی یۆنان لە شاری سالۆنیك لە دایکێکی یەهودی لە دایك بوە ، لە کۆتاییشدا دەوڵەتێك نەما بەناوی

ئیسلامەوە هەتا ڕۆژگارەی ئەمڕۆمان، هەروەها ولەهەمان کاتدا تواندنەوەی دەوڵەتی ڕوسیای قەیسەڕی کەدەوڵەتێکی نەصرانی بوو وەگۆڕینی بە دەوڵەتێکی شیوعی مارکسی ئەویش هاوشێوەی دەوڵەتی عوسمانی بە بەشداری کردنی لەو جەنگە خوێناویە و هەڵگیرساندنی شۆڕشێك لەناو خودی دەوڵەتەکە بە سەرکردایەتی سێ کەس کە هەرسێکیان لە یەهودەکانی خەزەر بوون!!!!

ئەوانیش(لینین، مارکس، ئەنجلس) لەو کات وساتەی کە ڕوسیا لە جەنگدا بوو، هەروکو چۆن پێشتریش ئاینی نەصرانیان لە ئەوروپادا نەهێشت لە ئەنجامی هەڵگیرساندنی شۆڕشی فەڕەنسی لە ساڵی ١٧٨٩ کە ئەم شۆڕشەش بە پاڵپشت وپارەی بنەماڵەی ڕۆچێلد هەڵگیرسا ،

ئا بەم جۆرە بەردەوام بوون لە بڵاوکردنەوە وسەپاندنی بیری ئیلحادی خۆیان لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەشێوەیەکی تۆکمە هاتنە مەیدان وهەوڵیان دەدا هەموو خەڵکی وەکو خۆیان لێ بکەن ، بۆ نمونە لەبواری پەروەردەو فێرکردندا کەسانی وەکو (داروین) هاتنە ناوەوە کە یەهودیەکی

خەزەری بوو بیردۆزی پەرەسەندنی کردە ناو پرۆگرامی خوێندنەوە(بەپێی بیردۆزەکە ئەسڵی مرۆڤ مەیمونە) کەهەموومان ئەزانین ئەمە پێچەوانەی ئایەتی خوای گەورەیە ، بەداخەوە هەتائێستاش لە زۆر شوێندا ئەخوێنرێت هەروەها لەبواری مێژووەوە مرۆڤیان گەڕاندەوە بۆ نیاندرتاڵ و وەحشیەت گوایە سەرەتا نەیزانیوە هیچ قسەیەك بکات کە ئەویش هەر پێچەوانەی ئایەتی قورئانە لەکاتێکدا الله تعالی بە ئادەم علیە السلام ئەفەرمووێت: (وعلم آدم الأسماء كلها) واتا الله هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد علیە السلام. وە هەروەها لەبواری فیکردا کەسانی وەکو (فرۆید ، نیچە، کامۆ) وە چەندینی تریان دروست کرد بۆ لە خشتەبردنی خەڵکی ودوورخستنەوەیان لە دین و بەرنامەی الله ، کە وایان لە خەڵکی کرد دین وەکوو کۆنەپەرستی و دواکەوتویی سەیر بکرێت و کەسە دیندارەکانیش وەکوو جاهیل و نەزان و کۆنەپەرست بناسێنرێن.

ئەمەی باسمان کرد مشتێك بوو لەخەروارێك لە پلانی گڵاو وفەساد وخراپەکاری ئەم گەلە موفسید خراپەکارە .

# هەڵگیرساندنی چەندان جەنگی خوێناوی و جیهان بەرەو ئاقارێکی تاریك

الله تعالی لە ئایەتی٤ی سورەتی ئیسراء دەفەرموێت:

(وَقَضَيْنَا إِلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا)

واتە: لە کتێبی تەوراتدا یان لە( لوح المحفوظ) دا بڕیارمان داوەو پێیان ڕاگەیاندوون کە سوێند بە خوا ئێوە لە بەرنامەی ئێمە لادەدەن و یاخی دەبن، و فەسادو خراپە دووجار لە زەویدا بەرپا دەکەن، (لە غەفڵەتی خەڵکیدا) زۆر گەشە دەکەن و دەسەڵاتێکی زۆر گەورە بەدەست دەهێنن (لەم سەردەمەدا دووبارە ئەم هەواڵە قورئانیە هاتۆتەوە دی) .

وەکو لای هەموان ئاشکرایە کاتێك کە فیرعەون حوکمی وڵاتی میسری ئەکرد خۆی کردبو بە خوا بەسەریانەوە (نعوذ بالله) ، هەموو گەلەکەی کردبوو بە کۆیلەی خۆی بەبێ جیاوازی ئەوانەی کە ڕازی بون بە

دەسەڵات وحوکمڕانی ئەو ، وەئەوانەشی کە ڕازی نەبون، بەڵام ئەوانەی کە ڕازی بوون بە حوکمڕانی ودەسەڵاتی فیرعەون و خوایەتی فیرعەونیان قبوڵ بوو ، لەژیانێکی تاڕادەیەك ئاسودە دەژیان بە بەرواورد لەگەڵ ئەوانی کە بە حوکمڕانی فیرعەون ڕازی نەبوون .

لەوکات وزەمانەدا بەنی ئیسرائیل لەژێر دەسەڵاتی فیرعەون دا بوون ،

بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی ووڵاتی میسر نەبوون،هەروەها خوایەتی فیرعەونیان ڕەت ئەکردەوە وقبوڵیان نەبوو بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە ئەچەوسێنرانەوە لەلایەن ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە ڕازی بوون بەدەسەڵات وحوکمڕانی فیرعەون، هەر وەکوو الله تعالی لە قورئاندا بۆمان باس دەکات و دەفەرمووێت:

(إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ)[١] .

---

١ - [القصص: ٤]

واتە: بەڕاستی فیرعەون گومڕاو زاڵ ودڕندە بوو لەسەر زەوی میسڕ خەڵکەکەی دابەش کردبوو جیاوازی خستبوە نێوانیانەوە کۆمەڵێکیان کۆمەڵەکەی دیکەیانی ئەچەوساندەوە ومنداڵەنێرینەکانی سەردەبڕی و کچان وئافرەتانیشی بەزەلیلی ئەهێشتنەوە.

هەربۆیە الله تعالی فیرعەون ودارودەستەکەی وئەوانەشی کە دوای کەوتبوون بەبەرنامە وحوکمڕانی وخوایەتی فیرعەون ڕازی بوون، جیاوازی نەخستە نێوانیان وهەمان حیسابیان بۆ دەکرێت هەروەکوو دەفەرموێت: (إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ).

هۆکاری باس کردنی چیرۆکی فیرعەون و دەسەڵاتە ستەمکارەکەی لێرەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە،کەپەیوەندی ولێکچونێکی زۆر هەیە لە نێوان فیرعەون و دارودەستەکەی لەگەڵ یەهودیەکانی خەزەر .

لێکچونەکەش ئەوەیە کە هەردولایان هەوڵی بەکۆیلە کردنی خەڵکیان داوە تاوەکو حوکم ودەسەڵات هەر لەژێر دەستی خۆیاندا بێت بە چاندنی

تۆوی خراپەکاری وفەساد و پلانی شەیتانی .

بەڵام جیاوازیەکەیان تەنها لەخاڵێکدایە ئەویش ئەوەیە کە فیرعەون حوکمڕانی وخوایەتیەکەی تەنها بەسەر قەومەکەی خۆیدا بوو ، بەڵام ئەم یەهودیە خەزەریانە هەموو کات هەوڵی حوکمڕانی ودەسەڵات وبەکۆیلە کردنی خەڵکیان داوە لە سەرتاسەری دونیادا بەدرێژایی مێژوو بەبێ جیاوازی .

هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێکرد و باسمان کردوە ئەم یەهودیانە بۆ جێ بەجێ کردنی پلانە گڵاوەکانیان بەبەردەوامی خەریکی هەڵگیرساندنی جەنگ وشەڕ بوون لەنێوانی وولاتان بەگشتی ، ئیتر بەبێ گوێدانە ئەوەی کە چەند کەس لەوشەڕانەدا دەمرن یان بێ ماڵ وحاڵ دەبن یان خەڵکی برسی دەبن یان وولات کاول و وێران دەبێت ،

بەڵکو گرنگ لای ئەوان جی بەجێ کردنی پلانەکانیان بوو لەهەمان کاتدا وڵاتان توشی قەرزاری وکارەسات بکەن وە لەکۆتایشدا ئەو وولاتانە

هانایان بۆ بەرن وداوای یارمەتیان لێ بکەن ومنەتی ئەوان هەڵگرن .

له گرنگترین ئەو جەنگانەش کە ئەوان پلان داڕێژەر و هۆکاری هەڵگیرساندنی بوون جەنگی جیهانی یەکەم بوو کە بوە هۆی کوژرانی ٩ ملیۆن کەس وکاولکردن و وێران بوونی چەندین وڵات له جیهاندا ،

لەو دەستکەوتانەش کە لەم جەنگە خوێناویەدا بەدەستیان هێنا بە کورتی لەچەند خاڵێکدا کۆدەکەینەوە :

- یەکەم: توانەوەی دەوڵەتی ڕوسیای قەیسەڕی کە دەوڵەتێکی مەسیحی ئەرسەدۆکسی بوو وەگۆڕینی بۆ دەوڵەتێکی شیوعی ومارکسی بی دینی کە لە پێشتریشدا باسمان کرد .

-دووەم: تواندنەوە ونەهێشتنی خەلافەتی ئیسلام ودەوڵەتی عوسمانی کە لە ساڵی ١٩٢٤ خەلافەتی ئیسلام بەیەکجاری کۆتایی هات .

-سێیەم: لەدوای تواندنەوەی خەلافەتی عوسمانی خاکی ژێر دەسەڵاتی خەلافەت دابەش کرا بۆ چەندین وڵاتی جیاواز بەشێوەیەك کەهەرگیز

٤. بە بەراورد بە هەردوو فەرموودەکە دەرکەوت کە کۆمەڵەی یەکەمی یەئجوج و مەئجوج بە ماوەیەکی زۆر و ساڵانێکی زۆر پێش دەرکەوتنی دەججال دێن بۆ خاکی قودس و ئاوی دەریاچەکەش هەر ئەو کۆمەڵەی یەکەم دەیخۆنەوە، پاش ئەوە ئینجا دەججال دەردەکەوێت بێگومان لەو کاتەشدا دەریاچەکە ووشکی کردوە، هەروەکوو لە فەرمودەکەی (جەسساسە)دا هاتووە.

٥. لەدوای ئەوەی عیسا علیه السلام دەججال دەکوژێت و سەربازە دڵسۆزەکانیشی لە یەهودە خەزەریەکانی دەوڵەتە ناشەرعیەکەی ئیسرائیل قەتڵوعام دەکرێن بە دەستی موجاهیدان، ئینجا کۆمەڵەی کۆتایی یەئجوج و مەئجوج دێن بۆ قودس بۆ تۆڵە سەندنەوەی براکانیان ، بێ گومان لەو کاتەشدا دەریاچەکە ووشکە و ئاوی تیا نەماوە ، بۆیە ئەوانیش دەڵێن کاتی خۆی لەم شوێنەدا ئاو هەبوە ، هەروەکوو لە فەرمودەکەی(النواس بن سمعان)دا هاتوە .

## چەند سەرنج و تێبینیەك و بەراوردێك لەنێوان گەلی یەئجوج و مەئجوج و یەهودیە خەزەریەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل

یەکەم: مەعلومی هەموو لایەکە ومێژووش شاهیدە کاتێك دەوڵەتی ئیسرائیل دروست بوو لە ساڵی ١٩٤٨، هەروەك پێشتریش بە ووردی باسمان لێوە کردوە ، ئەم دەوڵەتە هەموو خەڵکەکەی لە ووڵاتانی دیکەوە هاتون و لەسەر ئەو خاکە نیشتەجێ بوون، ئەوەشی کە جێی سەرنجە ئەوەیە ئەمانە لە یەك ووڵاتەوە نەهاتون بەڵکوو زیاتر لە(٥٠)پەنجا ووڵاتی پێنج کیشوەرەوە ئەم یەهودیە خەزریانە هاتون بۆ سەر خاکی فەلەستین وقودس!! ئەگەر بەتەواوی سەرنج بدەن ئەمەش سەلمێنەری ئایەتەکەی الله تعالی و فەرموودەکەیە کە دەفەرموێت: (وهم من کل حدب ینسلون) ئەوان لە هەموو شوێنێکەوە دەردەکەون ودێن!!!

دووەم: فەرموودەکەی (النواس بن سمعان) باس لەوە دەکات کە(یەئجوج و مەئجوج) بەچەند قۆناغێك دێن بۆ خاکی فەلەستین و قودس بەجۆرێك

کەکۆمەڵی یەکەمیان کاتێك دێن لە دەریاچەی تەبەڕیە دەخۆنەوە، هەتا دەگاتە کۆتا بەشیان کاتێك دەگەن دەریاچەکە ووشکی کردوە، بەهەمان شێوە کۆچ پێکردنی یەهودیە خەزەریەکانیش بۆ سەر خاکی فەلستین و قودس بەچەندین قۆناغ هاتون و تێپەڕیوە، سەرەتای کۆچ کردنیان لە ساڵەکانی ١٩٢٠بەدواوە دەستی پێکردوە، لەدوای کۆتایی هاتنی خەلافەتی دەوڵەتی عوسمانی و داگیرکردنی خاکی فەلەستین وقودس، ئەو کۆچ پێکردنەش هەتاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەیە وئێستاش بەردەوامە!!!

بۆ زانیاریتان ئەو یەهودیانەشی کە کۆچیان کردوە بۆ خاکی قودس و فەلەستین بەشێکی کەمی یەهودیەکانی جیهانن، تائێستاش بەشێکی زۆریان لە ووڵاتەکانی ئەوروپا وئەمریکا وڕوسیا نیشتەجێن، بەتایبەتیش سەرمایەدار وپلەدارەکانیان کە پێیان دەوترێت (نوخبە) .

(ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە قۆناغی یەکەمی ئەو کۆچکردنەی یەئجوج و مەئجوج تەواو بوە ئێستا نیشتەجێی خاکی قودس وفەلەستینن، بەڵام قۆناغی کۆتاییان هێشتان کۆچیان نەکردوە ونیشتەجێی ووڵاتانی ڕۆژئاوان) .

سێیەم: لە فەرموودەکە باس لەوە دەکات کە(یەئجوج ومەئجوج) دەریاچەی (تەبەڕیە) دەخۆنەوە هەتا ئەوەی کۆتا بەشیان فریای ئاوی دەریاچەکە ناکەون و دەڵێن لەم شوێنە ئاو هەبوە واتا (دەریاچەکە ووشکی کردوە)!!! ئاشکراشە لای هەموان کە دەریاچەی تەبەڕیە بە هەزاران ساڵە لەسەر خاکی فەلەستینە و سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و کشتوکاڵی فەلەستینیەکان بووە، بەبەردەوامیش پڕ بوە لە ئاو، بەڵام کاتێك یەهودیە خەزەریەکان کۆچیان کرد بۆ سەر ئەو خاکە و دەوڵەتە ناشەعیەکەیان دروست کرد ، ئەم دەریاچەیە بوو بە تاکە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە بۆ ئەوان هەتا ئەو کاتەش دەریاچەکە هەر پڕ لەئاو بوو ، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە لەدوای ساڵی ١٩٤٨وە کە ئەم دەوڵەتە دروست بوو

ئەم دەریاچەیە هێواش هێواش ڕووی لە کەمی کرد بە جۆرێك ئێستا ٨٠٪ لەسەدا هەشتای ووشکی کردوە، لەسەدا بیستەکەشی کە ماوەتەوە ئەوەندە تەنك بوە کە لەهەندێك شوێنەوە دەتوانیت بە پێ لەئەمبەری دەریاچەکە بۆ ئەوبەری بپەڕیتەوە بەبێ ئەوەی پێویستت بە بەلەم بێت !!!

کەوایە با پرسیارێك بوروژێنین !! کێ ئەم ئاوەی خواردەوە؟؟

لەوەڵامدا: دەڵێین یەهودیەکانی سەرخاکی فەلەستین هۆکاری کەم بوونەوەی ڕێژەی ئاوەکە بوون و هەر ئەوانیش بەکاریان هێنا و کردیان بەسەرچاوەی ئاو خواردنەوەیان !!! لە فەرموودەکەش دەفەرموێت دەریاچەی تەبەڕیە یەئجوج و مەئجوج دەیخۆنەوە.

کەواتە ئەم دوو فەرموودەیەش بەڵگەیەکی دیکەی سەلمێنەرە کە (یەهودیە خەزەریەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل) هەمان گەلی یەئجوج ومەئجوجن بەپاڵپشت بەو خاڵانەی کە ئاماژەمان پێدا لەسەرەوە لەگەڵ هەردوو فەرموودەکە و بەراوردکردنیان واللە تعالی أعلم .

## گەڕانەوەی پێغەمبەر عیسا علیه السلام جارێکیتر بۆ دونیا و کوشتنی دەجالی درۆزن

له بەشەکانی پێشودا چەند ڕاستیەکمان بۆ دەرکەوت بە پشت بەستن بە هەردوو فەرمودەکەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرموودەکەی(النواس بن سمعان) وەهەروەها فەرمودەکەی(الجساسة) کە هەردوو فەرموودەکە گوتمان سەحیحن و له سەحیحی موسلیمدا هاتون، دەرەنجامەکەش ئەمانەی خوارەوە بوون:

١. یەئجوج و مەئجوج بە چەند قۆناغێك دەردەکەون و دێن بۆ خاکی فەلەستین و قودس .

٢. قۆناغی یەکەمی کۆچکردنیان هاتوون و جێگیر بوونە لەسەر خاکی فەلەستین، زوڵم وستەم و فەسادی خۆیان لەویٚ بڵاوکردوەتەوە و دەریاچەی تەبەڕیەشیان بەکارهێناوە وەکوو سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەیان.

٣. دەریاچەی تەبەڕیە بەشێکی زۆری ووشکی کردوە و ئێستا لە قۆناغی کۆتایی ووشکبوندایە کە ئەم گەلە موفسیدە ئاوەکەیان بەکارهێناوە و خواردویانەتەوە.

٤. دەججال کاتێك دەردەکەوێت دەریاچەی تەبەڕیە ووشکی کردوە و ئاوی تیا نەماوە.

٥. بەشی کۆتایی یەئجوج و مەئجوج دوای دەججال دەردەکەون وە هەتا ئێستا کۆچیان نەکردوە بەڵکوو لەدوای گەڕانەوەی پێغەمبەر عیساش علیه الصلاة والسلام دەردەکەون و دێن بەرەو خاکی فەلەستین و قودس، هەر ئەو بەشەی کۆتاییشیان شوێنەواری دەریاچەکە دەبینن و دەڵێن لەم شوێنە ئاو هەبوە .

لەم بەشەشدا دەچینە سەر بابەتیکی گرنگ و هەستیار، ئەویش گەڕانەوە و هاتنەوەی پێغەمبەر عیسایە علیه الصلاة السلام جارێکی دیکە بۆ دونیا، گەڕانەوەی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە جارێکی تر بۆ دونیا یەکێکی ترە لە نیشانە

گەورەکانی کۆتایی دونیا وە هەروەها موژدەیەکی ووزە بەخشە بۆ موسوڵمانان و ستەملێکراوان کە جارێکی دیکە دادپەروەری و عەدالەتی الله تعالی بەرپادەبێتەوە لە دونیادا و حوکم و شەرعی الله تعالی دەگەڕێتەوە و مافی هەموو مافخوراوان وەردەگیرێتەوە و خێر و خۆشی بەرقەرار دەبێتەوە لە دونیا دوای ئەوەی کە زوڵم وستەم و بێ دینی دایپۆشیبوو .

بێگومان گەڕانەوەی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە علیه الصلاة والسلام لەقورئان و سوننەدا هاتوە وپشتڕاست کراوەتە و دەقی شەرعی تەواوی لەسەرە وهیچ شك وگومانێکی تێدا نیە ، بە دەقی شەرعی قورئان و سوننەش یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی .

هەروەکو الله تعالی لەئایەتی ٦١ی سورەتی الزخرف دەفەرمووێت: (وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ فَلا تَمْتَرُنَّ بِهَا). واتە: گەڕانەوەی ئەم پێغەمبەرە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی کەواتە بەگومان مەبن لێی و باوەڕی پێ بهێنن .

هەروەها الله تعالی دەفەرموویێت لەسورەتی النساء ئایەتی ١٥٩: (وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ)[١].

واتا : هەرچی خاوەن کتێبەکانن لە یەهود ونصارا ئیمان بە پێغەمبەر عیسا علیە الصلاة والسلام دەهێنن لە پێش مردنی ودوای ئەوەی جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە دونیا .

جگە لەوەش زیاتر لە(٥٠) فەرموودە لەسەر گەڕانەوەی ئەم پێغەمبەرە عیسا علیە الصلاة والسلام هاتوە کە زۆربەیان سەحیحن و لەبوخاری و موسلیمدا هاتوون .

پاشان هۆکاری گەڕانەوەی پێغەمبەر عیسا علیە الصلاة والسلام لەناو هەموو پێغەمبەران بە چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو هەروەکوو زانایان ئاماژەیان پێداوە وڕوونیان کردوەتەوە:

---

[١] - سەرچاوە، تەفسیری الطبری .

١. گەڕانەوەی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە بۆ بەدرۆ خستنەوەی جولەکەکانی بەنی ئیسڕائیلە کە دەڵێن ئێمە عیسامان کوشت !! کەهەمووشمان دەزانین لە قورئاندا الله تعالی پێی ڕاگەیاندوین کە نەکوژراوە وە لە خاچیش نەدراوە، هەروەکوو دەفەرموویت: (وماقتلوه وماصلبوه). بەڵکو پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئەوان .

٢. هەر پێغەمبەرێك بۆ هەر گەل وهۆزێك هاتبێ پەیامەکەی تەواو کردوە، یان گەلەکەی ئیمانیان پێ هێناوە، یان پێی کافر بوون و سەرپێچی پێغەمبەرەکەیان کردوە، الله تعالاش بەخراپترین شێوە ئەو گەلەی لەناو بردوە، بەڵام بەتەنها لەناویاندا پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام پەیامەکەی تەواو نەکرد، بەڵکوو الله تعالی هەڵیکێشا بۆ ئاسمان پەیامەکەی دواخست تاوەکوو لە ئاخیری زەماندا جارێکی دیکە بگەڕێتەوە و لەو کات و زەمانەدا پەیامەکەی تەواوی بکات.

٣ . بۆ بەدرۆ خستنەوەی دەجالی درۆزنە کە بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو مەسیحە و خوایە بەڵام لەڕاستیدا ئەو مەسیحی درۆزنە ، لەکۆتاییشدا هەر بەدەستی پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام دەکوژرێت و لەناو دەچێت .

٤ . هەروەها هەڵگرانی دینی نصارا باوەڕیان وایە کە لەکۆتایی زەماندا مەسیح دەگەڕێتەوە سەر زەوی و هەموو ئەو کەسانەی بییر وباوەڕی مەسیحیان هەیە لەگەڵ خۆی دەباتە ئاسمان ، بەڵام کاتێك پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام دێتەوە دونیا حوکم بە ئیسلام وشەرعی الله تعالی دەکات ، کە تەنانەت سەرانەشیان (جیزیە) لێ قبوڵ ناکات ، یان دەبیت ببن بە ئیسلام یان دەبێت بکوژرێن ،هەربۆیە الله تعالی دەفەرمووێت: (وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ).

٥. دوای دەرکەوتنی دەجال و بڵاوکردنەوەی فیتنەیەکی زۆر گەورە لەسەر زەوی کە لەهیچ سەردەم و زەمانێکدا دونیا فیتنەی وای بەخۆیەوە نەدیوە خوا پەنامان بدات، لەکاتێکدا ئیعلانی خوایەتی دەکات و زۆرینەی

خەڵکیش بڕوای پێ دەهێنن و بە خودای دەزانن ، ئا لەو کات وساتەدا پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام جارێکی تر دادەبەزێت ودێتەوە دونیا و دەبێتە سەرکردەی موەحیدان و موجاهیدان کە بەڕاستی لەوکاتەدا موسوڵمانان و موجاهیدان کەمینەیەکی زۆر کەمن، دەججالی درۆزنیش لەناو دەبات بۆ هەتا هەتایە ، هەروەکوو لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يقول: (لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ"، قَالَ: "فَيَنْزِلُ عِيسَى ابنُ مَرْيَمَ فَيَقُولُ أَميرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا، فَيَقُولُ: لَا، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءَ، تَكْرِمَةَ اللهِ هَذِهِ الأُمَّةَ)[١].

واتە: جابری کوڕی عبدالله (الله لەخۆی وباوکی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم دەجەنگن لەسەر حەق وە هەڵکەوتە ودیارن هەتا ڕۆژی دوایی، پاشان

[١] - أخرجه الأمام مسلم

فەرمووی: وەکاتێك عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت، ئەمیری ئەو کۆمەڵە موجاهیدە دەڵێت فەرموو پێش نوێژیان بۆبکە، ئەویش دەفەرموێت: نەخێر ئێوە هەندێکتان ئەمیرن بەسەر هەندێکی دیکەتانەوە ، ئەوە ڕێزی اللهیە بۆ ئەم ئوممەتە (ئوممەتی ئیسلام)) .

٦. لە فەرموودەکەی النواس بن سمعاندا هاتوە کە پێغەمبەر عیسا علیه السلام لە شاری دیمەشق دادەبەزێت لە سوریا بەڵام دواتر لەگەڵ موجاهدان بەرەو قودس و فەلەستین بەڕێدەکەون بۆ کوشتنی دەججال، هەروەکوو لەم بەشەی فەرموودەکەدا هاتوە: (فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فَلَا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلَهُ). واتە: لەو کاتەدا (موسوڵمانان گەمارۆ دراون لەلایەن لەشکر وسوپای دەججالەوە) الله تعالی مەسیحی کوڕی مەریەم دەنێرێت و دادەبەزێت لەلای مەنارە

سپیەکە، لەڕۆژهەڵاتی دیمەشق، جل وبەرگێکی زەردی لەبەردایە، هەردوو دەستی لەسەر باڵی دوو مەلائیکەیە ، قژی تەڕە ئەگەر سەری نەوی بکات ئاوی لێ ئەتکێت وئەگەر بەرزی بکاتەوە بە شێوازی دەنکە مرواری دەردەکەوێت هەرکافرێك بۆن وبەرامی هەناسەی بکات یەکسەرە دەمرێت ، هەناسەشی هەتا ئەو شوێنە دەڕوات کە چاو دەیبینێت، پاشان دوای دەججال دەکەوێت هەتا لەدەرگای (اللد) دەیگرێت (شوێنێکە لە نزیکی شاری قودس) ڕووبەڕوو دەبنەوە و دەیکوژێت.

٧. بێگومان دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام جارێکی دیکە بۆ دونیا لەکاتێکدایە کە دونیا پڕ بوە لە زوڵم وستەم، شەڕ و ئاژاوە و فیتنە و بێ دینی هەموو کونج وکەلەبەرێکی ئەم سەرزەویەی داپۆشیوە بە جۆرێك کە ئیسلام ئەوەندە غەریبە ئەوەندە بێ کەسە لە الله زیاتر هیچ پشت وپەنایەکی نەماوە لەو کاتەدا، هەربۆیە الله تعالى پێغەمبەرێك دەنێرێت بۆ سەرکردایەتی موسوڵمانان و لەناوچەی شامیش ئەو پێغەمبەرە دێتەوە دونیا هەموشیان دەزانین ئەو زوڵم وستەم و شەڕ و فیتنەو ئاژاوەیە

چەندین ساڵە یەخەو بەرۆکی موسوڵمانانی گرتوە لەزۆربەی وولاتانی ئیسلامی بەگشتی و لە ناوچەی شام وخۆرهەلاتی ناوەڕاستیش بەتایبەتی.

جا لە ئەنجامی ئەو هەموو زوڵم وستەمەی کە دەیان ساڵە دەرهەق بە موسوڵمانان دەکرێت بۆیە بەردەوام کۆمەڵێك لە موسوڵمانان ئەو زەلیلی و ناحەقیەیان پێ قبوڵ ناکرێت ولەسەر حەق دەجەنگن و تێدەکۆشن و جیهاد دەکەن لە پێناوی الله تعالی هەروەکو لە فەرمودەکەی پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ هاتوە و باسمان کرد کە دەفەرموویێت: (لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ) هەتا کۆتایی فەرموودەکە) واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم دەجەنگن لەسەر حەق، دەرکەوتە و دیارن، تا ئەو کاتەی عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام دادەبەزێت و دەبێت بە سەرکردەی لەشکری موسوڵمانان پاشان بە خۆی و لەشکرەکەیەوە هێرش دەکەنە سەر دەججال و سوپاکەی تا دەگەنە نزیك شاری قودس لەویێ ڕوو بەڕووی یەکتر دەبنەوە ولە کۆتاییشدا دەججال دەکوژرێت بە دەستی پێغەمبەر عیسا علیه السلام .

## سەرکەوتنی موسوڵمانان و لەناوچونی یەهودە خەزەریەکان و تێکشکاندنی دەوڵەتەکەیان

الله تعالی لەسورەتی غافر لە ئایەت ٥١دا دەفەرموویێت:

(إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ).

واتە: بەڕاستی ئێمە ئەو پێغەمبەرانەی کە ناردومانن بۆ گەل و هۆزەکان و ئەو کەسانەشی کە باوەڕ و ئیمانیان پێ هێناون سەریان دەخەین لە ژیانی دونیادا، هەروەها لەو ڕۆژەش کە شایەتەکان شایەتی دەدەن، لە ڕۆژی قیامەت (فریشتەکان شایەتی ئیمان بۆ پێغەمبەران دەدەن، هەروەها پێغەمبەرانیش شایەتی بۆ بانگخوازان دەدەن، بانگخوازانیش شایەتن لەسەر خەڵکی) .

دوا بەدوای کوشتنی دەججالی درۆزن و لەناوچون و تیاچونی بۆ هەتا هەتا، لەشکری موسوڵمانان و موجاهیدانی الله پەرست بەسەرکردایەتی پێغەمبەرەکەیان عیسا (علیه الصلاة والسلام) هێرشێکی چڕ و پڕو و بەهێز

دەکەن بۆ تەواوی دەوڵەتی ئیسرائیل بە شێوەیەك شەڕ و جەنگیان لەگەڵ دەکەن کە لە هیچ کات و زەمانێکدا بەو جۆرەیان پێ نەکراوە، هەرچی دار و بەرد هەیە لێیان دێنە دەنگ و بە موسوڵمانان دەڵێن ئەوە یەهودیە لە پشتمەوە خۆی حەشارداوە وەرە بیکوژە، بێگومان ئەمەش باجی ئەو هەموو زوڵم و ستەم و فەسادەی کە بەدرێژایی مێژوو بڵاویان کردوەتەوە و کردویانە دەرهەق بە مرۆڤایەتی بە گشتی و موسوڵمانان بەتایبەتی .

هەروەکو لەم فەرموودە سەحیحەدا پیغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرموویت:

عن أبي هريرة رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ، فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللهِ هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ إِلَّا الْغَرْقَدَ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ)[١].

واتە: ئەبی هورەیرە (الله لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[١] - صحيح مسلم

فەرمووی: دونیا کۆتایی نایەت و قیامەت هەڵناسێت هەتا موسوڵمانان لەگەڵ یەهود دەجەنگن، موسوڵمانان کوشتاری ئەوان دەکەن هەتا وای لێ دێت یەهودیەکان خۆیان حەشار دەدەن لە پشتی دار و بەرد، هاوکات دار و بەرد دێنە دەنگ لێیان و دەڵێن: ئەی موسوڵمان ئەی بەندەی خوا ئەمە یەهودیەکە لە پشتمەوە وەرە بیکوژە، تەنها داری غەرقەد نەبێت، کە داری یەهودیەکانە.

جا لێرەدا سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ تێبینیەکی گرنگ ئەویش ئەوەیە لەوانەیە بڵێن بەچیدا بزانین کە ئەو یەهودیانەی لە فەرموودەکەدا باسی لێوە کراوە هەمان یەهودیەکانی دەوڵەتی ئیسرائیلن؟ خۆ لە فەرموودەکەدا باسی دەوڵەتی ئیسرائیل نەکراوە !!. لە وەڵامدا دەڵێین:

- یەکەم: لەفەرموودەکەدا دەفەرمووێت: ئێوەی موسوڵمانان جەنگ و شەڕ لەگەڵ یەهوددا دەکەن، هەموشمان دەزانین کە تاکە دەوڵەتی دینی یەهودی لەسەرانسەری زەوی تەنها دەوڵەتی ئیسرائیلە .

- دووەم: لەفەرموودەکە زۆر بە ئاشکرا دەفەرموویێت: کە پێغەمبەر عیسا (علیه الصلاة والسلام) دەججال لە قودس دەکوژێت، ئێستاش قودس شارێکی گرنگی دەوڵەتی ئیسرائیله و خەریکیشه بیکەن بە پایتەختی دەوڵەتەکەیان .

- سێیەم: لە هەمووی گرنگ تر ئەم خاڵەیە کە الله تعالی لە سورەتی اسراء لە ئایەتی (١٠٤)دا دەفەرموویێت: (وَقُلْنَا مِنْ بَعْدِهِ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ اسْكُنُوا الْأَرْضَ فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا). واتە: ئێمە لە دوای ئەو هەموو سەرپێچی و یاخیبونەی نەوەی ئیسڕائیل کە کردیان پێیان وتن لەسەر زەوی بژین، هەتا کاتی تۆڵە لێ سەندنەوەتان دێت، ئەوکات هەمووتان لە یەك شوێن کۆدەکەینەوە وتۆڵەتان لێ دەسێنین) .

وەك باشیش دەزانین ئێستا ئەو تاکە دەوڵەتەی کە یەهودیەکانی کۆکردوەتەوە لە سەرانسەری دونیادا تەنها دەوڵەتی ئیسرائیله .

بەڵام لێرەدا خاڵێکی دیکەی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە کە لە ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: (بەنی ئیسرائیل)، لە کاتێکدا یەهودیە خەزەریەکان لە بەنی ئیسرائیل نین!!! ئەی چۆن دەکرێت بڵێین ئەو ئایەتە مەبەست لێی یەهودیە خەزەریەکان و دەوڵەتی ئیسرائیلە ؟؟

لە وەڵامی ئەم خاڵەشدا دەڵێین:

١. ئەسڵی یەهودیە خەزەریەکان لە گەلانی پشتی چیاکانی قەوقازن کە خەڵکانێکی وەثەنی بت پەرست بوون لە بنچینەدا، هەروەها خەڵکانێکی موفسید و تاوانکار و شەڕانگێز بوون، بەڵام هۆکاری یەهودیبونیان یەهودیەکانی بەنی ئیسرائیل بوو کە هاوپەیمانیەکی باشیان لەگەڵیان بەست هەتا ئەوەی کە بوون بە هاودین،کە پێشتریش باسمان کرد، ئەو هاوپەیمانێتیە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان هەر بەردەوامە .

٢. ئەوانەی کە کۆچیان کرد بۆ سەر خاکی فەلەستین و قودس خۆ تەنها یەهودیە خەزەریەکان نەبوو بەڵکوو یەهودیەکانی بەنی ئیسرائیلیش بوون لە وولاتانی عەرەبی و ناوچەکەش، وولاتەکەشیان بەهەمان شێوە بەیەکەوە دروست کرد ،واتا ئایەتەکەی الله تعالی ئەمڕۆ بە تەواوی بە چاوی خۆمان دەیبینین کە جێبەجێ بوە .

٣. ئەو فەساد و تاوان و زوڵم وستەمەی کە بڵاوبوەوە لە سەرانسەری جیهان بە گشتی و وولاتانی موسوڵمان نشین بەتایبەتی یەهودیە خەزەریەکان کردیان بە هەماهەنگی لەگەڵ یەهودی بەنی ئیسرائیل .

٤. ئەو دوژمنکاریەی کە لە مێژودا یەهودەکانی بەنی ئیسرائیل کردویانە لەگەڵ موسوڵمانان هیچی کەمتر نەبوە لەوەی کە یەهودیە خەزەریەکان کردویانە هەربۆیە الله تعالی لە قورئاندا پێمان دەفەرمووێت: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا). واتە: ئێوە دەبینن کە سەرسەختترین دوژمنی ئیماندارانن جولەکە و ئەوانەن کە هاوبەش پەیدادەکەن بۆ الله تعالی) .

لە کۆتایشدا الله تعالی تۆڵەیان لێ دەستێنێت لەسەر دەستی کۆمەڵەی موسوڵمانان و ئیمامەکەیان وە جارێکی دیکە خاکی فەلەستین و قودس فەتح دەکەن و کۆتایی بە دەوڵەتی داگیرکەری ئیسرائیل دەهێنن و کۆمەڵەی یەکەمی یەئجوج و مەئجوجیش قەتڵوعام دەکرێن، دوا بەدوای لەناوچون و کۆتاییهێنانی دەوڵەتی ئیسرائیل ئینجا هێرشی پاشماوە و کۆتا بەشی یەئجوج و مەئجوج دەست پێ دەکات بۆسەر موسوڵمانان و خاکی قودس بۆ تۆڵە سەندنەوە و پشتگیری برا یەهودیەکانیان لە دەوڵەتە ڕوخاوەکەیان .



## هاتنی کۆتا هێزی یەئجوج ومەئجوج و لەناوچونیان بۆ هەتا هەتایە

الله تعالی لە سورەتی ئال عیمران ئایەتی ١٦٠دەفەرمووێت:

(إِنْ يَنْصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ).

واتە: ئەگەر الله تعالی سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت ئەوە هیچ کەسێك ناتوانێت سەرکەوێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەربدات، ئەوە کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکتان بکات و سەرتان بخات، دە با ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن. لە دوای ئەوەی کە دەججالی درۆزن کوژرا بە دەستی پێغەمبەر عیسا علیه السلام هەروەها لەشکری موجاهیدان خاکی فەلەستین و قودسیان فەتح کرد، لێرەدا بە پشتیوانی الله تعالی باسی ئەو هێزە دەکەین کە دێن بۆ پشتیوانی و تۆڵە سەندنەوەی برا یەهودیەکانیان دوای ئەوەی کە الله تعالی تۆڵەی لێ سەندنەوە بەدەستی موسوڵمانان و

موجاهیدان بە خراپترین شێوە لەناوی بردن و دەوڵەتە ناشەرعیەکەشیان لەناوچوو، بێگومان ئەو هێزەش کەدێن بریتین لە پاشماوەو دوابەشی یەئجوج و مەئجوج.

بە پشتیوانی الله تعالی دەچینەوە سەر فەرموودەکەی (النواسی کوڕی سەمعان) الله لێی ڕازی بێت وە ئەو بەشەی فەرموودەکە هەڵدەبژێرین کە باس لەهێرشی ئەو هێزەی پاشماوەو دوابەشی یەئجوج ومەئجوج دەکات کە دەفەرموویێت: (فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللَّهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي ، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ، وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لِأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لِأَحَدِكُمْ الْيَوْمَ فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الْأَرْضِ) .

واتە: دوای ئەوەی کە دەججال کوژرا و خاکی فەلەستین و قودس فەتح کرا کۆتایی بە جەنگ هات، عیسای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەگەڵ خەڵکەکە دانیشتبوو ، الله تعالی وەحی بۆ نارد ، فەرمووی ئێمە کۆمەڵێ عەبدی خۆمانمان بۆت دەرکردوە کە هیچ کەس ناتوانێت بەرەنگاریان بێتەوە، عەبدەکانی من ببە بۆ سەر کێوی طور، الله تعالی یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت ئەوان لە هەموو لایەکەوە و لە هەموو شوێنێکەوە هێرش دەهێنن بۆ قودس ، هەتا دەگەنە دەریاچەی طەبەریە (بێگومان لەو کاتەدا ووشکی کردوە)، یان ئەگەر ئاوێکی کەمی تێدا مابێت ئەوەش دەخۆنەوە هەتا ئەوەی کە کۆتا هێزیان هیچ ئاوێك لە دەریاچەکە نابینن ، لەم کاتەدا عیسا علیه الصلاة والسلام و هاوەڵەکانی لەسەر کێوی تورِ گەمارۆ دەدرێن و توشی برسێتی وناڕەحەتیەکی زۆر دەبن لەسەر کێوەکە، پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرمووی: لەو کاتەدا سەری گایەك بۆ یەکێکیان لەو شوێنەدا لە ١٠٠ دیناری ئاڵتونی بۆ یەکێك لەئێوە لە ئێستادا چاکترە ئیتر عیسا علیه الصلاة والسلام و هاوەڵەکانی دەست دەکەن بە

دوعاکردن و پاڕانەوە لە الله تعالى کە لەو برسێتی و ناڕەحەتیە ڕزگاریان بکات، دوابەدوای ئەوە الله تعالى کرمێك بۆ ئەو هێزەی یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت بەناوی (النغف) لە ملیان دەدات وهەموویان دەکوژێت و لەناودەچن، پاشان پێغەمبەر عیسا و هاوەڵەکانی جارێکی دیکە لەسەر کێوەکە دێنەوە خوارەوە.

لێرەدا چەند ڕاستیەکمان بۆ ڕووندەبێتەوە لەفەرموودەکەدا:

- یەکەم: هۆکاری هاتنی ئەو هێزەی یەئجوج و مەئجوج بۆ خاکی فەلەستین و قودس بۆ تۆڵە سەندنەوەی برا یەهودیەکانیانە کە لە دەوڵەتە ناشەرعیەکەیان (ئیسڕائیل) قەتڵ وعام کراون لەلایەن موسوڵمانانەوە، هەر وەکوو لە بەشی پێشووش باسمان کرد بە فەرموودەی سەحیح، (دار و بەرد لە یەهود دێنە قسە و دەڵێن ئەمە یەهودیە لە پشتی منەوە وەرە بیکوژە) هەموویان دەکوژرێن بە خراپترین شێوە، لێرەدا ئەگەینە ئەو ڕاستیەی کە ئەگەر دەوڵەتی ئیسڕائیل هەمان یەئجوج ومەئجوج نەبن ئەی باشە بۆچی ئەمانە لە هەموو شوێنێکەوە دێن بۆ ڕوو بەڕووبونەوە لەگەڵ هێزی

موسوڵمانان و پشتیوانی یەهودیەکانی (ئیسرائیل) دەکەن بەتایبەتیش بۆ قودس ئەی بۆ ڕوو لە وڵاتێکی دیکە ناکەن ئەگەر هاوشێوەی خۆیان نەبن؟؟

- دووەم: ئایەت و فەرموودەکەش بە ئاشکرا دەفەرموویت: کە یەئجوج و مەئجوج لە یەك جێگا و شوێنەوە نایەن هەروەکو دەفەرموویت: (من کل حدب ینسلون)، بەڵکو لەهەموو شوێنێکەوە دەردەکەون ودێن، کە هەمووشیان بەهەمان شێوە هەر ڕوو لە قودس دەکەن و دێن بۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسوڵمانان.

- سێیەم: گومانی تێدا نیە کە هێزەکەی یەئجوج ومەئجوج ئەوەندە زۆرن کە موسوڵمانان ناتوانن بەرنگاریان ببنەوە ، هۆکاری ئەو زۆریەشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆربەی خەڵکی وڵاتانی دونیایان وەکو خۆیان لێ کردوە (لەڕووی نەمانی دین وکلتور وسەپاندنی سیستەمی جیهانگیری) هەر وەکوو لە بەشەکانی پێشوتریش باسمان لێوە کردوە و پشتڕاستمان کردوەتەوە بە فەرموودەی سەحیح، بۆیە الله تعالى وەحی بۆ

پێغەمبەرەکەی دەنێرێت کە عەبدەکانی بەرێتە شوێنێکی دیکە (سەر کێوی تورٍ) هەتا ئەوکاتەی الله جوندی خۆی دەنێرێت بۆ یەئجوج و مەئجوج ئەویش کرمی (النغف)ە هەتا لەناویان دەبات بۆ هەتا هەتایە .

پاشان لە بەشی پێش کۆتایی فەرموودەکەی النواسی کوڕی سەمعان الله لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (ثم يهبط نبي الله عيسى وأصحابه إلى الأرض، فلا يجدون في الأرض موضع شبر إلا ملأه زهمهم ونتنهم، فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه إلى الله ، فيرسل الله طيرا كأعناق البخت فتحملهم ، فتطرحهم حيث شاء الله ، ثم يرسل الله مطرا لا يكن منه بيت مدر ولا وبر، فيغسل الله الأرض حتى يتركها كالزلفة، ثم يقال للأرض: أنبتي ثمرتك، وردي بركتك، فيومئذ تأكل العصابة من الرمانة، ويستظلون بقحفها، ويبارك في الرسل حتى إن اللقحة من الإبل لتكفي الفئام من الناس، واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس، واللقحة من الغنم لتكفي الفخذ من الناس). واتە: دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا عیسا عليه الصلاة السلام و هاوەڵەکانی دادەبەزنە

خوارەوە لەسەر کێوەکە، جێگای بستێك نەماوە لەسەر ئەو خاکە کە بۆگەنی کەلاکی ئەو گەلە پیس وموفسیدەی لێ نەبێت (یەئجوج و مەئجوج)، لەو کاتەدا عیسا علیه السلام و هاوەڵەکانی هاوار دەبەن بۆ الله و لێی دەپاڕینەوە کە الله تعالی لەو کارەساتە ڕزگاریان بکات و ئەو بۆگەنیەی سەر زەوی نەهێڵێت، بۆیە الله تعالی باڵندەیەکی مل درێژیان بۆ دەنێرێت کە ملیان وەکوو ملی ووشتر وایە، ئەو کەلاکانە هەموو هەڵدەگرن و دەیبەن بۆ ئەو شوێنەی کە الله ویستی لەسەرە و پاشان بارانێکی بەخوڕ دەبارێنێت و زەویان لێ پاك دەکاتەوە، فەرمان بە زەوی دەکرێت بەروبومی دەربکات و بەرەکەتی بگەڕێنێتەوە، بە فەرمانی الله تعالی ئەوەندە بەرکەت ڕوودەکاتە سەر زەوی کە کۆمەڵێك کەس لە یەك هەنار دەخۆن و تێری لێ دەخۆن، هەروەها شیری مەڕ ومالات ئەوەندە بە بەرەکەت دەبێت کە عەشرەتێك لە گوانی یەك ووشتر دەخۆنەوە.

## مانەوەی پێغەمبەر عیسا علیه السلام لەناو موسوڵمانان

بەم جۆرە پێغەمبەر عیسا علیه السلام دەمێنێتەوە لەناو ئوممەتی ئیسلام و حوکمڕانی دەکات بۆ ماوەی چەند ساڵێك کە لە هەندێك لە ڕیوایەتەکاندا دەڵێت ٤٠ ساڵ حوکم دەکات، وە لە هەندێك ڕیوایەتی دیکە دەڵێت تەنها ٧ ساڵ حوکم دەکات. بۆ ئەمەش زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە هەندێکیان پێیان وایە کە پێغەمبەر عیسا علیه السلام کاتێك هەڵکێشرا بۆ ئاسمان تەمەنی ٣٣ ساڵ بوو، دوای ئەوەی کە دێتەوە خوارەوە ٧ ساڵ حوکم دەکات پاشان کۆچی دوایی دەکات کە بەمەش تەمەنی دەکاتە ٤٠ ساڵ، وە هەندێکی دیکە لە زانایان ڕاوبۆچونیان وایە کە پێغەمبەر عیسا علیه السلام جگە لە تەمەنی خۆی کە ٣٣ ساڵ بوە ٤٠ ساڵی تەواویش حوکم دەکات، پاشان کۆچی دوایی دەکات، ئوممەتی ئیسلامیش پاش کۆچی دوایی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە تەنها ٧ ساڵ دەمێنێتەوە لەسەر زەوی ئیتر خوای گەورە هەمووی دەمرێنێت، کە زانایان ئەم ڕاوبۆچونەی دوەمیان زیاتر پەسەند دەکەن والله تعالی أعلم.

ئەم دوو فەرموودەیەی خوارەوەش سەلمێنەری ئەو دوو ڕاوبۆچونەی زانایانن کە باسمان کرد هەردوو فەرموودەکەش سەحیحن:

فەرموودەی یەکەم: عن أَبِي هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (الْأَنْبِيَاءُ أُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ , وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ , وَإِنَّهُ نَازِلٌ , فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ, فَإِنَّهُ رَجُلٌ مَرْبُوعٌ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ , وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ وَإِنَّهُ يَدُقُّ الصَّلِيبَ, وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ وَيُفِيضُ الْمَالَ, وَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الْإِسْلَامِ, حَتَّى يُهْلِكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي إِمَارَتِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا غَيْرَ الْإِسْلَامِ وَحَتَّى يُهْلِكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي إِمَارَتِهِ مَسِيحَ الضَّلَالَةِ الْأَعْوَرَ الْكَذَّابَ وَتَقَعُ الْأَمَنَةُ فِي الْأَرْضِ, حَتَّى يَرْعَى الْأَسَدُ مَعَ الْإِبِلِ وَالنَّمِرُ مَعَ الْبَقَرِ , وَالذِّئَابُ مَعَ الْغَنَمِ, وَتَلْعَبُ الصِّبْيَانُ بِالْحَيَّاتِ لَا يَضُرُّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا , يَلْبَثُ أَرْبَعِينَ سَنَةً ثُمَّ يُتَوَفَّى ﷺ وَيُصَلِّي عَلَيْهِ المسلمون)[1] .

[1] - أخرجه أبو داود في سننه (٤٣٢٤) ، وأحمد في المسند (٩٢٧٠) ، وإسناده صحيح قَوِيّ.

واتە: ئەبو هورەیرە الله لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرمووی: پێغەمبەران دایکانیان زۆرن و جیاوازن بەڵام ئاینیان یەك ئاینە، منیش لە هەموو کەسێك لە پێشترم بۆ عیسای کوڕی مەریەم، چونکە هیچ پێغەمبەرێك نەبوە لە نێوان منو ئەودا، ئەو جارێکی دیکە دادەبەزێتە سەر زەوی، ئەگەر بینیتان بیناسنەوە، پیاوێکی چوارشانەی سوورەیە بەلای سپیدا، سەری وەك ئەوە وایە ئاوی لێ بتکێ یان بچۆڕێ ئەگەر تەڕیش نەبێت، ئەو کاتێك دادەبەزێت خاچ تێکدەشکێنێت و بەراز دەکوژێت، سەرانە(جزیە) هەڵدەگرێت و پارە زۆر دەبێت، کوشتار دەکات لەگەڵ خەڵکی لەسەر ئەوەی ببنە موسوڵمان، هەتا لە ئەمارەتەکەیدا الله تعالی هەموو ئوممەتان بە هیلاك دەبات تەنها ئیسلام نەبێت، هەروەها لە ئەمارەتەکەی ئەودا الله تعالی مەسیحی گومڕاکەری کوێری درۆزن بەهیلاك دەبات وە لەناو دەچێت، پاشان ئەمن وئەمان لەسەر زەوی بەرقەرار دەبێت، هەتا ئەوەی شێر و ووشتر لە یەك لەوەڕگەدا دەلەوەڕێن، پلینگ و مانگا و گورگ و مەڕیش بەهەمان شێوە، منداڵان بە مار یاری

دەکەن هیچیان زیان بەیەکتر ناگەیەنن(مەبەست هیچ دوژمنکاریەك نامێنێت تەنانەت لەناو ئاژەڵانیشدا)، چل ساڵ دەمێنێتەوە و پاشان وەفات دەکات علیه السلام، موسوڵمانانیش نوێژی لەسەر دەکەن) .

فەرمودەی دووەم: عن عبد الله بن عمرو قال : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فِي أُمَّتِي فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ - لَا أَدْرِي: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا، أَوْ أَرْبَعِينَ عَامًا فَيَبْعَثُ اللهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ ، ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ ، لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ رِيحًا بَارِدَةً مِنْ قِبَلِ الشَّأْمِ ، فَلَا يَبْقَى عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ أَوْ إِيمَانٍ إِلَّا قَبَضَتْهُ)[١].

واتە: عبداللەی کوڕی عەمرِ الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەججال دەردەچیت بۆ سەر ئوممەتەکەم، چل دەمێنێتەوە لەناویان- نازانم: چل ڕۆژی وت، یان چل مانگ، یان چل

[١] - أخرجه مسلم في صحيحه (٢٩٤٠) .

ساڵ پاشان الله تعالى عیسای كوڕی مەریەم دەنێرێت ڕێك دەڵێی عورووەی كوڕی مەسعودە، دەگات بە دەججال و دەیكوژێت، پاشان حەوت ساڵ لەناو خەڵكیدا دەمێنیتەوە، لە نێوان هیچ كەسێكدا دوژمنایەتی نامێنێت، پاشان الله تعالى بایەكی سارد دەنێرێت لە شامەوە، هیچ كەسێك لەسەر زەوی نامێنێت بەقەدەر گەردیلەیەك خێر و ئیمان لە دڵیدا بێت ئیللان بەو بایە ڕوحی دەكێشرێت).

جگە لەم فەرموودانە چەند فەرموودەیەكی دیكەشمان هەیە ئەوە پشتڕاست دەكەنەوە كە ٤٠ ساڵ حوكمڕانی دەكات بۆیە زانایان زیاتر ئەو ڕاوبۆچونەیان لا پەسەندترە كە ٤٠ ساڵ حوكمڕانی بكات والله تعالى أعلم.

بۆیە هەر بە بەڵگەی ئەو فەرموودانە لەسەردەمی حوكمڕانی پێغەمبەر عیسا علیه السلام دونیا لە ئارامترین و خۆشترین سەردەمیدایە، ئوممەتی ئیسلام لە هەموو كاتێك خۆشتر و ئاسودەتر دەژین لەسەر زەوی، كە پێشتر لەوپەڕی ناخۆشی و زوڵم ستەم و برسێتیدا دەژیان، هەروەكو لە

فەرموودەکەشدا هاتوە هیچ دوژمنکاری و ڕق و کینەیەك نامێنێت لە دڵی هیچ کەسێکدا تەنانەت لەناو ئاژەڵانیشدا هیچ دڕندەیی وڕقێك نامێنێت وەکوو ئەوەی سەروەرمان باسی کردوە ﷺ ، مەڕ و گورگ ، مانگا و پڵینگ پێکەوە دەلەوەڕن لەیەك لەوەڕگادا.

ئەوەشمان بیر نەچێت پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام بە قوڕئان و سوننەت حوکمڕانی ئوممەت دەکات، یاسا و دەستوری ووڵات لەسەر شەریعەتی ئیسلام و قوڕئان دەڕوات، نەك لەسەر ئینجیلی دەستکاری کراوی بەناو نەصرانیەکانی ئەمڕۆ یان یاسا دەستکردەکانی ئەم سەردەمە.



## حەج کردنی پێغەمبەر عیسا علیه السلام و پاشان وەفاتکردنی

هەروەها ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە عیسا علیه الصلاة والسلام لەماوە سەردەمی حوکمڕانیەکەیدا سەردانی حەجی ماڵی خوا دەکات هەروەکوو لەم فەرموودە سەحیحدا هاتوە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه أنه النبي ﷺ قال : والذي نفسي بيده ليهلن بن مريم بفج الروحاء حاجا أو معتمرا أو ليثنيهما)[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە عیسای کوڕی مەریەم لە(فج الروحاء) ڕێگایەکە لە بەینی مەککە و مەدینە، تەهلیلەی الله دەکات بۆ حەج کردن یان عومرە کردن یان بۆ هەردوکیان بەڕێوەیە .

[1] - صحيح مسلم .

لێرەدا ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیەکی سەلمێنەری دیکەیە کە پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەم علیه الصلاة والسلام دوای ئەوەی دادەبەزێتەوە سەر زەوی هاوکات حوکمڕانی ئوممەت بە شەریعەتی الله و سونەتی پێغەمبەر محمد ﷺ دەکات هەر بۆیەش فەریزەی حج و عومرە بەجێ دەگەیەنێت چونکە لەسەر شەریعەتی ئیسلام دەڕوات .

لێرەدا سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ فەرموودەیەکی دیکە کە تایبەتە بەم بابەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: ليحجن البيت وليعتمرن بعد خروج يأجوج ومأجوج، عن قتادة وقال عبد الرحمن عن شعبة قال: لا تقوم الساعة حتى لا يحج البيت)[1].

واتە: ابی سەعیدی خدری دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: حەج وعومرەی ماڵی خوا دەکرێت تەنانەت دوای دەرچونی

[1] - صحيح البخاری

یأجوج ومأجوج یش، دواتر قەتادە دەگێڕێتە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قیامەت هەڵناسێت هەتا ئەو کاتەی هیچ کەس حەجی ماڵی خوا ناکات .

وەك ئاشکرایە لای هەموان حەج کردن پەرستشێکە تەنها تایبەتە بە موسوڵمانانەوە وە هیچ دین و ئاینێکی دیکە پەیڕەوی ناکەن، لێرەدا مەبەست لە فەرموودەکە ئەویە کە لەو کاتەدا حەج کردن قەدەغە کراوە یان حەرەمی مەککە داخراوە بە ڕووی موسوڵماناندا والله أعلم، جا ئیتر بە هەر هۆکارێك بێت ، بەڵام دوای ئەوەی عیسا علیه الصلاة والسلام دێتەوە دونیا جارێکی دیکە حەج کردن دەسپێدەکاتەوە بەڕووی موسوڵماناندا و خۆیشی ئەو فەریزەیە بەجێ دەگەیەنێت .

هەروەکو ئێستاش دەبینین حاڵی حازر کە کەعبە چۆڵ کراوە لە عەمرەکاران بە هۆکاری نەخۆشی و ڤایرۆسی کۆرۆنا، لەوانەشە فەریزەی حەجیش ئەمساڵ جێبەجێ نەکرێت، ئیتر والله أعلم، ئایا ئەم قەدەغە کردنەی ئێستا هەمان ئەوەی فەرموزدەکەیە کە باسی لێوە کردوە یان

کاتێکی ترە ؟؟ ئەوە تەنها الله دەیزانێت غەیبیش تەنها لای الله یە .

دوابەدوای حەج کردنی پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام ئیتر بۆ هەتا هەتا ئەم دونیایە بەجێ دەهێڵێت و کۆچی دوایی دەکات و دەگەڕێتەوە لای پەروەردگاری ، لەدوای کۆچی دوایی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەش هیچ خێر و خۆشیەك لە دونیادا نامێنێت ، پاشان هەرچی ئیماندارە لەسەر زەوی دەمرێت، دوابەدوای مردنی ئیماندارانیش چەند نیشانە و عەلاماتێکی دیکەی کۆتایی دونیا دەردەچێت وەکوو خۆرهەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە هەروەها ڕوخاندنی کەعبەی پیرۆز ئیتر تەنها ئەو کەسانە دەمێننەوە لە دونیا کە خراپترین و فاسدترین کەس بونە، وەکوو ئاژەڵی کێوی دەکەونە یەکتری لەسەر زەوی، هەربۆیە قیامەتیش لەسەر ئەوان هەڵدەستێت .

هەروەکو لە کۆتایی فەرموودەکەی النواسی کوڕی سەمعانیشدا باس کراوە بەم شێوەیەیە:

(فبینما هم كذلك إذ بعث الله ريحا طيبة فتأخذهم تحت آباطهم ، فتقبض روح كل مؤمن وكل مسلم، ويبقى شرار الناس يتهارجون فيها تهارج الحمر ، فعليهم تقوم الساعة). واتە: اللە تعالی بایەکی بۆن خۆش بۆ ئیمانداران دەنێرێت (لە ڕیوایەتێکی دیکە دەڵێت بایەکە لە یەمەنەوە دێت) لەبن باڵی هەمو ئیمان دار و موسوڵمانێك دەدات و ڕوحی دەکێشێت ، وە خراپترین کەسەکان لەسەر زەوی دەمێننەوە وەکو کەری کێوی شەڕ دەکەن و بەیەکدا دەچن، قیامەتیش لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت.

داواکارم لە اللە تعالی بە ئیمانەوە بمانگەیەنێت بەو ڕۆژگارە پڕ عیزەت و شکۆدارە وبەچاوەکانی خۆمان ببینین وە بەکارمان بهێنێت بۆ سەرخستنی دینەکەی و بمانکات بە سەربازێك لە سەربازەکانی خۆی و لە ژێر ئاڵای لااله الا الله و ئیمرەتی پێغەمبەرەکەیدا بمانژیێنێ و لەپێناو دینەکەی بە شەهیدی وەرمانبگرێت وقبوڵمان بفەرمووێت، وەکۆتایی ئاڵای کوفری و حوکمڕانی دیموکراسی و ڕوخانی عەلمانیەت و لەناوچونی سیستەمی جیهانگیری بە چاوەکانی خۆمان ببینین، اللهم آمین .

## سەرنج و ئامۆژگاری

لەکۆتاییدا دەمەوێت ئاماژە بەوە بکەم، کوشتنی (دەجال) بە دەستی (پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام) و دواتر قەتل وعام کردنی یەهودیەکان وپاشان هاتنی کۆتا هێزی (یەئجوج و مەئجوج)، هەموو ئەمانە لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دواییە، کە بریتین لە کۆمەڵە فیتنە وشەڕ وئاژاوەیەکی زۆر گەورە، جا بۆیە ئاگادار بە ئەگەر موسوڵمانێکی تەقوادار و خاوەن عەقیدەیەکی پاك و بۆ خوا سوڵحاو نەبیت هەرگیز درك بەم ڕووداوانە ناکەیت !!

بیهێنە بەر چاوی خۆت حاڵی حازر زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی دونیا دەوڵەتی ئیسرائیل بە دەوڵەتی ئاشتی وپێشکەوتوخواز وفریادڕەس دەبینن و پشتگیری تەواوی ئەو دەوڵەتە دەکەن !!!!

لەهەمان کاتێشدا موسوڵمانانی موەحید و الله پەرست و بۆ خوا سوڵحاو (بەتایبەتی موجاهیدان) بە تیرۆریست وکۆنەپەرست وخوێن ڕێژ وپیاو کوژ لەقەڵەم دەدەن!!!!

ئەی باشە لەپاشەڕۆژدا کاتێك ئەم ڕوداوانە ڕوودەن و هێزی موسوڵمانان دەوڵەتی ئیسرائیل قەتڵ وعام بکەن، کە باجی زوڵم و ستەم و فەساد و خراپەکاری چەندین ساڵەیانە و تەمامی عەدلی الله تعالایە کە دەبێت تۆڵەیان لیّ بسێنرێت، دەبێت لە ڕاگەیاندنەکانەوە چی بە هێزی موسوڵمانان و ئیمام و پێغەمبەرەکەیان عیسا علیه الصلاة والسلام بوترێت ؟؟!!

بەتایبەتی کە لەم ڕۆژگارە پڕ فیتنەیەدا هەموو ڕاگەیاندنەکان بە دەستی جولەکە و سیستەمی جیهانی نوێیە، بۆیە برایان و خوشکانی ئیماندارم ئاگاداربن بزانن دینەکەتان لە کێوە وەردەگرن، بەقسەی ڕاگەیاندنەکان هەڵنەخەڵەتێن وفریو نەخۆن، دین لە ڕاگەیاندنەوە وەرناگیرێت دین سەرچاوەی خۆی هەیە کە قورئان و سوننەیە، نەك ڕاگەیاندن!!!

جا ئەوە باش بزانە دەججال لەکاتێکدا دێتە دونیاوە بە شەخسی خۆی کە خەڵکی لەنەبونی وبرسێتی وقاتوقڕیدایە ، خۆراك وپارە وپولیش لای ئەو دەستدەکەوێت ، بۆیە دەججال لەو کاتەدا داواکاریەکانت بۆجێبەجێ دەکات!! بەڵام لەسەر حیسابی دینەکەت و فەوتاندنی دوارۆژت لە قیامەتدا !!!

بۆیە پاساو بۆ خۆت نەهێنیتەوە بەناوی برسێتی ونەبونی لەکاتێکدا بویتە بە سەرباز وداردەستەی دەججال (هەروەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ لێرە ولەوێ دەبیستین کە لەبەر نەبونی وبێ کاری بوونە بە سەربازی طاغوتان و بەرگری لێ دەکەن لە ژێر ناوی خاك ونیشتیمان) .

پاشان ئەوەش بزانە کە پێغەمبەر عیسا علیه الصلاة والسلام کاتێك دادەبەزێت ودێتەوە بۆ دونیا ، دەبێت بە پێشەوا و سەرکردەی موجاهیدان! نایەت بەقات و بۆینباخ وسەیارەی جام ڕەش لەسەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆك و پاشا و سەرکردە دەججالۆکەکانی ئەمڕۆ دانیشێت!

بەڵکو ئەو بۆ لەناو بردیان و تیاچونیان دێتەوە دونیا .

جا برا و خوشکانی من ئەگەر لەو ڕۆژگارەدا کەسێك الله تعالی بەڕەحمی خۆی بەسیرە و بەرچاوڕونی پێ دابێت ئەوا ناسینەوەی ئەوە پێغەمبەرەی بۆ ئاسان دەبێت، لە هەمان کاتیشدا بە هەزاران و ملیۆنان کەس(لە پێشی هەمویانەوە بەناو موسوڵمانە مەتاتیە نوێژکەرەکانی ئەمڕۆ کە تاغوت و دەججالۆکەکانی ئەم زەمەنە بە وەلی ئەمری خۆیان دەزانن) پێی دەڵێن تیرۆریستە !!!



## لە کۆتایی

لە کۆتایشدا دەڵێم خوشك و برای ئیماندارم حەز دەکەم ئاگەدارتان بکەمەوە لە بابەتێکی گرینگ هەرچەندە زۆریش هەڵدەگرێت.

پێش هەموو شتێك با ئاگاداربین نابێت ئێمە دوای زۆرینە بکەوین، چونکە ئێمەی ئیماندار ئەگەر دەستمان تەواو بە دینەکەمان و بە قورئان و سوننەتەوە نەگرین، هەروەها هەوڵی فێربوونی زانستی شەرعی نەدەین و ئیخلاسمان بۆ الله نەبێت، ئەوا هەرگیز بەرچاوڕوون نابین و ئەو کۆمەڵەیەی لەشکری موسوڵمانان و پێشەواکەیان کە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکاندا باسی کردوە بەهیچ شێوەیەك ناناسینەوە!!!

بەڵکو دوور نیە بە تیرۆریست و خەواریج ناویان بهێنین!!

هەروەکوو واقیعی ئەمڕۆ، چونکە بەڕاستی فیتنەکە ئەوەندە گەورەیە هەموو ڕاستیەکانت لێ دەشێوێنن کافر و موشریك و زاڵمت لێ دەکەن بە پیاو چاك وفریادڕەس، و

موجاهید و پیاوانی بۆ خوا سوڵحاویشت لیٚ دەکەن بە توندڕەو تیرۆریست و پیاو کوژ و خویٚن مژ.

بۆیە هۆکاری سەرەکی گومڕایی خەڵکیش لەم سەردەمەدا بەگشتی دەگەڕیٚتەوە بۆ نەزانی و جاهیلی زۆربەی ئەوخەڵکە کە دین لە ڕاگەیاندنی عەلمانی و دەججالەکانی سەردەم وەردەگرن.

پاشان بۆ مەلا و ئیمامە گومڕاکەرەکان و بانگخوازەکانی بەردەرگای دۆزەخ کە سەریان لە خەڵکی شیٚواندوە و هەموو حەق و ڕاستیەکانیان لە خەڵکی شاردوەتەوە، دڵنیابن قسە و باس و چیرۆك خویٚندنەوەی مەلای گومڕا و سەرلیٚشیٚواوەکانی سەر شاشەی ڕاگەیاندنەکان و کەناڵەکان سوودمان پیٚ ناگەیەنن وهیٚندەی تر توشی گومڕایی و سەرلیٚشیٚواویمان دەکەن کە بەبەردەوامی کۆمەڵیٚك پیٚشەوای گومڕاکەر (الأئمة المضلون) خەڵکی فریو و لەخشتە دەبەن.

جا ئامان برایان و خوشکانم با ئاگادار بین، بزانین دین لە کێ ولە کوێوە وەردەگرین تاوەکو هەم دونیا و قیامەتیشمان نەدۆڕێنین .

داواکارم لە الله تعالی نور و بەسیرەمان پێ ببەخشێت بۆ ئەوەی شوێن حەق و ڕێبازی تەوحید بکەوین و ثابت و دامەزراومان بکات لەسەر ڕێگای ڕاست و دینی حەق...... امین

براتان: کاوە ئەسعەد حەسەن

اللهم أرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه وأرنا الباطل باطلا وارزقنا اجتنابه.

نَسأَلُ اللهَ عَزَوَجَل أَن يُعَجِّل فَرَجًا لِهَذِهِ ٱلأُمَّةَ ٱللَّهُمَّ أَقِم عَلَمَ ٱلجِهَادَ وَاَقمِع أَهلَ ٱلزَّيغِ وَٱلفَسَاد وَٱنشُر رَحمَتَكَ عَلَى ٱلعِبَادِ وَٱلبَلاد يَا مَن لَهُ ٱلدُّنيَا وَ ٱلآخِرَة وَإِلَيهِ ٱلمَعَاد وَصَلَى ٱللهُ وَسَلَمَ وَبَارَكَ عَلَى عَبدِكَ وَرَسُولِكَ نَبِيِّنَا مُحَمَّد ٱلَّذِي حَثّ أُمَّتَهُ عَلَى ٱلجِهَاد لِيُخرِجَ العِبَاد مِن عِبَادَة العِبَاد إِلَى عِبَادَة رَبِّ العِبَاد وَعَلَى آلِهِ وَأَصحَابِهِ أَجمَعِين

# ناوەڕۆك